# کێشەی ویلایەتی موسڵ لە دوو ڕۆژنامەی سلێمانیدا

نەوزاد عەلی ئەحمەد

**زنجیرەی (٣٤)**

**لە کتێبە چاپکراوەکانی شارەوانی سلێمانی**

**سەرپەرشتیاری پرۆژەی چاپکردن**

**پێشرەو ئەحمەد**

# کێشەی ویلایەتی موسڵ لە دوو ڕۆژنامەی سلێمانیدا

بابەت: مێژوویی

نوسینی: نەوزاد عەلی ئەحمەد

کۆمپیوتەر: تاڤگە فائق

نەخشەسازی بەرگ: قادر میرخان

چاپ: ئۆفسێتی ژیر

تیراژ: (٥٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن (٧٦٧)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری ٢٠٠٤

# پێشەکی

لە هەموو دنیادا دەقی نێوگۆڤار و ڕۆژنامەو دەقی نووسراو بریتین لەو بەڵگانەی کە دەتوانرێت لێکۆڵینەوەو قسەو باسی نوێیان بۆ بنووسرێت، ئەرشیف و مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیش لە زۆر ڕووەوە هێشتا هەقی خۆی پێنەدراوە بە تایبەتیش بۆ بواری لێکۆڵینەوە. نەخوازەڵلا وەك بەڵگەی مێژوویی کەم پشتی پێبەستراوەو هەست بەو کەلێنە دەکرێت، لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەین بابەتێکی هەستدارو گەرمی نێو ڕووداوەکانی ئەمڕۆی کوردستان بوروژێنین و، بە سوود وەرگرتن لە ڕۆژنامەگەری کوردی بابەتی کێشەی ویلایەتی موسڵ دەخەینە ڕوو، کتێبەکە بریتی‌یە لە سێ بەش:

–بەشی یەکەم : پێداچوونەوەی کۆمەڵێك بابەت و بیرو بۆچوون کە سەبارەت بە کێشەی ویلایەتی موسڵ نووسراون، زیاتر بابەتەکەمان گێڕاوەتەوە (گواستۆتەوە) تەنیا لە چەند شوێنێك نەبێت لە ژێر ڕۆشنایی بیرو بۆچوونە ووتراوەکاندا بیروڕای خۆمان دەربڕیوە.

–بەشی دووەم: هەوڵمداوە کەبزانرێت کە ڕۆژنامەکانی (ئومێد ئیستقلال) و (ژیانەوە) چۆن کاریان لەسەر ڕووداوێکی ڕۆژیی وەك کێشەی ویلایەتی موسڵ کردووە، پێوەندی هونەری ڕۆژنامەگەریمان لەگەڵ بابەتەکە (کێشەکە) باسکردووە، کەئایا کێشەکە وەك ڕووداوێکی ڕۆژ لەهەردوو ڕۆژنامەکەدا لە بارەی هەواڵ و وتاردا چۆن کاریان تێدا کراوە.

–بەشی سێیەم: بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان کێشەی ئەوسای ویلایەتی موسڵ بریتییە لە کۆمەڵێك وانە و پەندی مێژوویی، لەو ڕوانگەیەوە بۆ خۆمان و بۆ نەوەی تازەمان ئەو دەق و نوسینانەمان جارێکی تر نووسیوەتەوە کە هەردوو ڕۆژنامەکە سەبارەت بە کێشەی ویلایەتی موسڵ بلاویان کردۆتەوە.

دەکرێ ئەم بابەتەی ئێمە نووسین و لێکۆڵینەوەی تری بەدوا دابێت چونکە بەداخەوە کورد ئەوکێشەیەی فەرامۆشکردووە، لە چەند نووسین و پەراوێزێك بترازێت شتێکی زانستی و ئەکادیمی لەسەر کێشەکە نەنوسراوە.

نەوزاد عەلی ئەحمەد
سوید۔ ستۆکهۆڵم
٢٠٠٤/١/١

# مێژووی موسڵ

ئـەو سـنوورو چـوار چێوەیـەی کەئـەمڕۆ بـەجوگرافیای ناسـراوە، لەسـەرچاوە مێژووییـە کۆنـەکاندا نـاوی هـاتووەو ئاوەدان بـووە، زیـاتر لـەچاخی بـەردینی نوێـدا (٩٠٠٠_٣٠٠٠پ.ن) ئەو سنوورە دێتە بەرچاو، لەو ماوەیەدا مرۆڤ بۆ پاراستنی خۆی دیوار و گردۆڵکەی بەرزی دروست کـردوە تالەهێرشـەکانی بەرامبـەر خـۆی بپارێزێت، سـەرچاوە مێژوویـەکان بـاس لەگردۆڵکـەی (تەپـە گـەورە[1] . tepegewra) دەکـەن کـە کەوتۆتەباکوری ڕۆژهەڵاتی موسڵی ئەمڕۆ، دیارە لەچاخی کۆن (٦٠٠٠٠٠_٣٠٠٠٠پ.ن) چاخی ناوەڕاست (٣٠٠٠٠_٩٠٠٠پ.ن) ناوی ئەو سنورە هاتووە، بەڵام زیاتر لەچاخی نوێدا دەتوانین بۆ خستنە ڕووی مەبەستەکەمان سوودمەند بین چونکە لەو سەردەمەدا کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بنیاتی کارو کۆکردنـەوەی تێکۆشـانی گۆڕانکاریـەکی بـەرچاوی بـەخووەبینیوە، پـاش هێرشـە گـەورەکانی مێـژوو چارەنووسـی موسـڵ وەك هەرپارچـە خاکێکی ناوچەکەو دەوروبەری ڕووبەڕووی هێرش و داگیرکردن بۆتەوە، وەك شارەکانی تری ئەمڕۆی کوردستان دووچاری کێشەو شەڕو ماڵ وێرانی و بەرگری کردن بۆتەوە، لەم ڕووەوەدەتوانرێـت مێـژوی (گوتـی، ئاشـوری، کـاردۆخی، میتـانی، حیسـی، میـدی، ئەخمینی، پارسـی) سـەیر بکرێت بە خوێندنـەوەی وردەکارییـەکانی نێـو ئـەو مێژووانـە ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە، کە خـەڵکی نەینەوای کۆت هەرهـەموویان لە ڕەگەزی سامی نین، بەڵکو نەتەوەی تیایە کە بە زمانی تر قسە دەکەن، یۆنانییـەکان وڵاتـی کوردستانیان بەسەر دوو ناوچەدا دابەش کردبوو:

١-وڵاتی میدیا: ئـەو ناوچانـە دەگرێتـەوە کـە دەکەونـە نێـوان ڕووبـاری گـەورە لـە باکوور و دەشتی ڕافیدەین لە خواروو ڕووباری دیجلە لە ڕۆژئاوادا.

٢-وڵاتی کاردۆخۆی: ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە دەکەونە نێوان گۆماوی وان (wan) و ناوچەکانی ڕۆژئاوای هاوسنوری باکورو شاری موسڵی ئێستا بەلای خوارووداً بەڵام ئەخمینی وپارسی ساسانیەکان بەنیوەی خوارووی وڵاتـی کوردسـتانی ئێستایان دەوت وڵاتی مادا (میدیا) و بە باکوورەکەشیان دەوت کوردوئین و هەندێك جاریش پێیـان دەوت وڵاتی گوردیا[2] .

لەسـەردەمی فتوحـاتی عـەرەبی ئیسـلامدا نـاوی موسـڵ هـاتووەو زۆربـەی مێژوونوسـانی ئەوسەردەمەو تا پێش و پاشی سەردەمەکە ناوی کوردیـان لەشـارەکەدا هێنـاوەو لـەوبارەدا دەتوانرێـت سـەیری نووسـینەکانی (ئـەژدی) و (مەسـعودی) و (ئیـبن حوقـەل) و (ئەنسـاری) بکرێـت و نووسـینەکانیان بەڵگـەی حاشـا هەڵنـەگرن و سەرچاوەی جێگای متمانەن بۆ کاری زانستی و لێتوێژینـەوەی ئەکادیمی، زنجیرەکـانی

مێژووی شارەکە بێجگە لەبوونی ژمارەیەکی بەرچاوو دیاری کورد لە شارەکەدا خاڵی توانەوەی کوردمان بۆ دەگێڕنەوە، ئەو پرۆسێسەش لەهەر سەردەمو قۆناغێکدا بەشێوازو شێوەیەکی جیا بەڕێوە چووە، بەڵام لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامدا بەعەرەب بوونی کورد بەئاشکرا بەرووی ئەو مێژووەدا دیارە.

سەبارەت بەبوونی کورد لەشاری موسڵدا پێم چاکە چەند پەرەگرافێك لە لێکۆڵینەوەی (موسڵ شاری عەرەبو کورد. لە رووی جوگرافیاو مێژوودا) وەربگرین:

-ئەنساری کە ساڵی ١٣٢٦ مردووە دەنووسێت: کورد لە موسڵ جێگیر بووەو لە کۆنەوە لەوێ کاردەکات، لەناو شارەکەدا گەڕەکیان هەیەو لە دەرەوەشدا ئاژەڵداری دەکەن.

-گەشتیاری فەرەنسی ئۆلیفیەکە لە نیسانی ١٧٩٥ سەردانی موسڵی کردووە دەڵێت: لەشارەکەدا (٧-٨) هەزار مەسیحیو نزیکەی هەزار یەهودیو (٢٥) هەزار ئیسلامی عەرەبو (١٥ تا ١٦) هەزار کورد هەیە:

-گەشتیاری بەریتانی کە رۆژی (٢٥)ی تەموزی ١٧٩٧ سەردانی موسڵی کردووە پێی وایە کەزۆربەی دانیشتوای شارەکە کوردن.

-گەشتیار ئۆلیڤەر ساڵی ١٨٠٩ ژمارەی دانیشتوانی موسڵی بە (٦٣) هەزارکەس داناوەو بەم شێوەیە (٢٥) هەزار عەرەب (١٥) هەزار کورد (١٥) هەزار تورك (٧) هەزار مەسیحی و هەزار یەهودی.

-گەشتیاری جێمس بگنگهام کەلە تەموزی ١٨١٦ سەردانی موسڵی کردووە دەنووسێت دانیشتوانی شارەکە بەشی هەرە زۆریان ئیسلامن لەڕووی ژمارەوە عەرەبو تورکو کورد یەکسانن.

-مارشاڵی ئەڵمانی هوڵمس ڤۆن مۆلتکە کە لەئایاری ١٨٣٨ سەردانی موسڵی کردووە دەنووسێت: دانیشتوانی شارەکە بریتین لە کوردو کلدانو عەرەب لەنێوان خۆیاندا بە زمانەکانی کوردیو فارسیو عەرەبیو تورکی قسە دەکەنو گفتوگۆ دەکەن[٣].

بەڵگەکان پێمان دەڵێن کە کورد لەموسڵ ژیاوەو نووسینەوەی مێژووی شارەکە بەبێ بوونی کورد مێژوویەکی لاوازو نازانستی دەردەچێت تا بۆ نمونە وەك زنجیرەیەکی مێژوویی سەیری ماوەی حوکمرانی عوسمانیەکان (١٥١٦-١٩١٨) بکەین دەبینین عوسمانیەکان میری میرنشینی بۆتان (بەدربەگ-ی یەکەم)[٤] یان کردۆتە حاکمی شارەکە، میرانی کورد نزیکەی (١٠٠) ساڵ حاکمی شارەکە بوون، دەکرێت بۆ زیاتر لێك جیاکردنەوەی ولایەتی موسڵو شاری موسڵ[٥] چەند دێڕێك سەبارەت بەپێشینەی مێژوویی ولایەتی موسڵ وەربگرین چونکە ئەو ڕستەو ژمارانەی کە لەدێڕەکانی پێشەوەدا ئاماژەمان پێدا زیاتر پەیوەندیان بەخودی شاری موسڵەوە هەبووە، بەڵام ویلایەتی موسڵی عوسمانی تاساڵی (١٨٧٨)یش بەولایەتی شارەزوورەوە ناسراوە، شاری کەرکوکیش مەڵبەندی بەڕێوبەرایەتیەکەبوو، ولایەتەکە تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، کاتێك هێزەکانی بەریتانیا ئەستانەیان گرت، ڕاستەوخۆ بەبابی عالیەوە بەند بوو، سنووری ولایەتەکە لەباشوورەوە بەشارۆچکەی مەندەلی سەر سنوری ئێران دەستی پێدەکردو تاخاڵی فەتحەی سەر ڕووباری دیجلە بەزنجیرە چیای حەمرین دا درێژ دەبۆوە،

لەکاتێکدا سنووری خۆرهەڵاتو باکووری خۆرهەڵاتی، بەپێك گەیشتنی سنووری ئێران کۆتاییان دێت بۆیەدەکرێت بڵێین بەڕێوبەرایەتیەکە لیوا- پارێزگاکانی ئێستای موسڵ، دهۆك، هەولێر، کەرکوك، سلێمانیو بەڕێوبەرایەتی چەند قەزایەکی پارێزگای دیالەی دەگرتەوە، کوردیش زۆرینەی دانیشتوانی ولایەتەکە بوونو ڕێژەیان لەو سەرژمێرەی ساڵی (١٩٢٤)دا، کە عێراقو بەریتانیا ڕێکیانخست (٦،٧٠٪) بوو، لەکاتێکدا ڕێژەی عەرەب (٨، ٢٣٪) تورکمانەکان (٥،٥٪) بوو[٦]، عەرەبی ولایەتەکە لەشاری موسڵ وشارۆچکەو گوندەکانی باشوری خۆرئاوای گرتبوونەوە، تورکمانەکانیش لە شارۆچکەی تەلەعفەری خۆرئاوای موسڵ و شاری کەرکوك و چەند شارۆچکەیەکی باشوریدا هەبوون.

بەڵام ئەگەر جوگرافیای ویلایەتی موسڵ ڕوونتر بخەینە ڕوو بریتییە لە:

١-سنجاقی[٧] ناوەند واتە موسڵ ئەم قەزایانەش دەگرێتەوە: دهۆك، زاخۆ، شەنگار و ئاکرێ.

٢-سنجاقی کەرکوك، ئەم قەزایانەشی بەسەرەوە بووە: هەولێر، ڕانیە، ڕەواندز، کۆیەو کفری.

٣-سنجاقی سلێمانی،ئەم قەزایانەی دەگرێتەوە (بازیان)، هەڵەبجە، شارەزور، مەرگە[٨].

دەکرێ بۆ دۆزینەوەی ئەڵقەی نەپساوەی شاری موسڵ بەسنوری کوردستانەوە سەیری چەند دۆکیومێنت و سەرچاوەیەکی تر بکەین کە کرۆکی مەبەستەکەمان بۆ تۆکمە دەکەن:

-(کێشەی موسڵ لەجەوهەردا کێشەی کوردستانی باشور بوو، کەپێشتر ویلایەتەکەی موسڵ ناوی ویلایەتی شارەزور بوو، پایتەختەکەشی شاری کەرکوك بوو، ئەو ویلایەتی شارەزورەش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانلیەوە بە کوردستان دادەنرا بەشایەدی هەموو مێژونوسەکانی عوسمانلی وئەنسکلوپیدیاکەی عوسمانلی کە بە (قاموس الاعلام) ناونرا بوو.

ئەو قاموس الاعلامەش لەباسی شارەزور و کەرکوکدا دەڵێ: کەرکوك پایتەختی شارەزوری کوردستانەو لە چوارا سێ بەشی کوردن و بەشەکەی تریش تورکمان و گاورو جولەکەو عەرەبن.

مێژوونوسەکانی ڕوسیش لە سەرو هەمویانەوە مینۆڕسکی ویلایەتی موسڵیان هەر بە کوردستان داناوە ئەو ئامارانەی کەهەر سێ دەوڵەتە ناکۆکەکەش لەسەر ویلایەتی موسڵ داویانە بە (کۆمەڵەی نەتەوەکان-عصبە الامم) هەر یەکەشیان بۆ نیازی خۆی دیسان هەر کوردیان بەبەشە زۆرەکەی ویلایەتی موسڵ داناوە هەرچەندە ئەوێ دەمێ زۆر کوردیش لەترسی ڕەشبگیری خۆیان ناونوس نەکردبو[٩].

-(لەویلایەتی موسڵدا کوردو عەرەب ومەسیحی وتورك و جو دەژین وبەپێی زۆریی ژمارەیان گرنگیان هەیە، کورد زۆرینەی دانیشتوان پێك دێنن ئەوان عەرەب و تورك نین و بەزمانێکی ئاری دەدوێن. تورکی ویلایەتی موسڵ لەڕەگەزی تورکی -تورکیان. یەزیدیەکان موسڵمان نین و لە کوردەکانەوە نزیکن، بەڵام بەهۆی ئایینەکەیان و گۆشەگیریان بون بەتاقمێکی جیاواز[١٠] و زۆربەی مەسیحیەکان لەنەستوری وکلدانی پێك

هاتون، تەنها کۆمەڵە خەڵکێکی زۆرو گەورەی یەکگرتو لە ناوچەیەکی فراواندا بژین کوردو عەرەبن هێڵی جیاکەرەوەی هەردوو ڕەگەز ڕوباری دیجلەیە تا یەکگرتنی لەگەڵ زێی بچوك و پاشان ڕێگای کەرکوك-کفری بۆ باکور و ئەم هێڵە شاری موسڵ لەسەر زەمینی پڕ بەپیت و دانیشتوانی زۆر جیادەکاتەوە)[11] .

ئەم بەڵگانەو کۆمەڵێ بەڵگەی تر کە لەنێو دوتوێی کتێبە مێژوییە زانستیەکاندا باسکراون ویلایەتی موسڵ لەڕوی دانیشتوانەوە بە زۆرینەی کورد لە قەڵەم دەدەن و ڕێژەی بونی نەتەوەکانی تریش بریتین لەکەمە نەتەوەو پێویستە لە چوارچێوەی ئەو جوگرافیایەدا داوای مافەکانی خۆیان بکەن و چارەنوسیان بە چارەنوسی زۆرینە ببەستنەوە، بۆ شاری موسڵ-یش دەکرا سود لە ژمارەی کوردی شارەکە ببینرێت، نەك ئەو ژمارەیە فەرامۆش بکرێت.

کەواتە چارەنوسی ویلایەتی موسڵ چۆن داشکایەوە؟ لە ماوەی حوکمڕانی عوسمانیەکاندا ئەو چوارچێوەیەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێ عیراق بریتی بوو لە ویلایەتەکانی بەغدادو بەسرەو موسڵ؟ بە دۆڕاندنی تورکیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا ململانێکان بۆ دابڕان و بردنی سامانی ئەو سێ ویلایەتە تا دەهات گفتوگۆی گەرمی لێ دەکەوتەوە، لە جەنگی ناوبراودا ویلایەتی موسڵ کەوتە ژێر کۆنترۆڵی بەریتانیاو داگیری کرد، چونکە هێزەکانی بەریتانیا پێشتر ناوچەکانی تری عیراقیان داگیر کردبو لە (٥)ی تشرینی دوەمی ساڵی (١٩١٨) چونکە ناو شاری موسڵ سەرەڕای بونی ڕێکەوتنی ئاگر بەستی مۆدرۆسی نێوان سوپای عوسمانی و بەریتانی و کە لە (٣٠) تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨) مۆرکرابو. بەلام سەرکردەی هێزەکانی بەریتانیا (سیر ولیام) ئەو ڕێکەوتن نامەیەی فەرامۆش کردو چوە ناو شاری موسڵەوە، ئەوەی جێگەی ئاماژەیە ململانێکانی فەرەنساو بەریتانیا لەسەر پاوان کردنی ناوچەکە گەرم بوو هەربۆیە پێش یەکلاکردنەوەی ڕوبەری ویلایەتەکانی بەسرەو بەغدادو موسڵ لە ڕێکەوتنی نهێنی سایکس-بیکۆی نێوان هەدو لایاندا کە ساڵی (١٩١٦) ئیمزا کرا لەسەر ئەوە ڕێکەوتون کە ویلایەتی موسڵ بۆ فەرەنسا بێت ویلایەتەکانی بەسرەو بەغداش بۆ بەریتانیا دیارە دوای ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا و ویلایەتی موسڵ-یان داگیر کرد ڕێکەوتنی سایکس بیکۆ کاری پێنەکراو سیاسەتێکی تر لەناوچەکەدا پێڕەوکرا، پاش ئەمە چەند ڕێکەوتنێك و کۆبونەوەیەکی چارەنوس ساز لەنێوان وڵاتە زلهێزەکانی بەریتانیاو ڕوسیاو فەرەنسا کرا بە تایبەتی دوای ئەوەی زانرا کە ئەو ناوچەیە یەکێکە لە ناوچە هەرە دەوڵەمەندەکانی نەوت لە کۆنگرەی ئاشتیدا وتوویژی نێوان فەرەنساو بەریتانیا بەردەوام بو تاڕۆژی (١٨)ی نیسانی ١٩١٩ ڕێکەوتن نامەی نەوتی (بیرینجی-لۆنگ BRINOER-LONG) مۆرکراو لەماددەی چواردا هاتووە کە (٢٥٪)ی سەرمایەی کۆمپانیای نەوتی تورکیا لە موسڵ و بەغدا بە فەرەنسا بدرێت بەڵام پاش ماوەیەکی کورت فەرەنسا هەستی بە زیانی کردو پاشگەز بووەو لە (٢٥ی نیسانی ١٩٢٠) ڕێککەوتنامەی (برینجی-لۆنگ) ڕاست کردەوە ئینجا لە پێناوی شێوە گونجاندنێکی شیاو سیاسەتی ئینتیداب گفتوگۆی لەسەرکراو ڕۆژی (٢٦ی مایسی ١٩٢٠) ڕاگەیەنراو، ئەمانە هەمووی ڕێخۆشکەر بوون بۆ ئەوەی چوارچێوەو سنووری عێراق دیاری بکرێتو وەك دەوڵەتێکی خاوەن جوگرافیاو سنوورێکی دیاریکراو بناسرێت لەم ڕوانگەیەوە کار بۆ ڕێککەوتنێکی تر کرا ئەوە بوو لە

(١٠ی ئابی ١٩٢٠) لە نێوان هاوپەیمانان و تورکیا پەیمانی سیڤەر[١٢] مۆرکرا، ئەم پەیمانە سیفەتی یاسایی بە رێککەوتنامەی سان ریمۆو سیستەمی ئینتیداب بەخشی بەپێی مادەی (٩٤) عێراق خرایە ژێر ئینتیدابەوە بەپێی مادەی (٢٢)ی باوەڕنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان هەمان مادده باسی ئەوەشی کردبوو کەلیژنەیەك بۆ دەست نیشانکردنی هێڵی سنوری تورکیاو عێراق دابمەزرێ کەلەماددەی (٢٧)ی ئەم پەیمانەدا دەست نیشانکراوە، ئەم هێڵەش بەرۆژهەڵاتدا بەسنووری تورکیاو سوریادا تاخاڵێکی سەر سنووری باکووری ویلایەتی موسڵ درێژ دەبێتەوەو لەوێشەوە بەرۆژهەڵات تایەکگرتنی سنووری تورکیاو ئێران درێژ دەبێتەوە لەو گفتوگۆو راگۆڕینەوەو رێکەوتننامانەی کەلەنێوان وڵاتانی زلهێز کراوەو بەرێوە چووە زۆرجار کوردو کێشەی کوردستان باسی لێوە کراوە، لەگفتوگۆکانی ئاشتی نێوان هاوپەیمانان و تورکیا کە لە (١٠ی ئابی ١٩٢٠) بە رێککەوتننامەی سیڤەر کۆتایی هات لە هەر سێ ماددەی (٦٢، ٦٣، ٦٤) باس لە مافی ئۆتۆنۆمبوونی ئەو ناوچانە دەکات کە زۆربەیان کوردن و سنوورەکەیان دەکەوێتە رۆژئاوای رووباری فورات و باشووری ئەرمینیاو باکووری سنووری تورکیا-سوریاوتورکیا-عێراق، لە ماوەی ساڵێك لە جێبەجێکردنی ئەم پەیمانەشدا، ئەگەر کوردەکان ئەو ناوچەیە بەشێوەیەك روویان کردە کۆمەڵەی نەتەوەکان کە پیشاندەری ئارەزووی سەربەخۆیی زۆربەیان بن-لە تورکیاو ئەگەر کۆمەڵەی نەتەوەکان قایل بوون بەوەی کە دەتوانن ئەو سەربەخۆییە بپارێزن سەربەخۆییان بدرێتێ، لەم حاڵەتەشدا هاوپەیمانان کۆسپ ناخەنە رێگای ئەوەی کوردەکان بچنە پاڵ ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەوە کەلە کوردی دانیشتووی ئەو بەشەی کوردستان پێکهاتووەکە لە سنووری ویلایەتی موسڵدا بوون، بەڵام ئەم نەخشەیە جێبەجێ نەکرا چونکە تورکیا پەیمانی سیڤەری مۆر نەکرد.[١٣]

دوای ئەوەی بەریتانیا توانی عێراق بۆ خۆی پاوان بکات و پاش لکاندنی ویلایەتی موسڵ-یش بەویلایەتەکانی بەغداو بەسرە لە تەموزی (١٩٢١) پێکهاتەیەکی جوگرافی بەناوی میرنشینی عێراق دروست کردو میر فەیسەڵی کوڕی شاحوسێن-ی لەحیجاز هێناو کردی بەمەلیکی میر نشینەکە، ئەم جۆرە هەڵس و کەوتەی بەریتانیا کۆمەڵێك پرسیاری لێکەوتەوەو خەڵك بەگومانەوە سەیری سیاسەتی بەریتانیای دەکرد بەتایبەتیش پاش دۆزینەوەی نەوت و لەهەموو رێکەتننامەکاندا پێشەکی باس لە دابەشکردنی سامانی عیراق لە نێوان دەوڵەتە زلهێزەکان دەکرا.

ئەو ماوەیەی کە پەیمانی سیڤەر مۆرکرا زۆربەی وڵاتان کاریان بەماددەو بەندەکانی نەدەکردو فەرامۆشیان کردبوو، بۆیە چەند کۆبوونەوەیەك و دیدارێکی ئاشتی لە لۆزان گرێدرا لە پێناوی خاوکردنەوەی کێشەکانی وڵاتانی زلهێز کە خاکی عێراق یەکێك بوو لە کێشە گەرمەکانی گفتوگۆی نێوانیان و (دوا پەیمانی ئاشتی لە نێوان هاوپەیمانەکان و تورکیادا لە لۆزان رۆژی (٢٤)ی تەموزی (١٩٢٣) ئیمزا کرا ئەو پەیمانە لەلایەن ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیاو ژاپۆن و رۆمانیاو یۆگسلافیاو تورکیاوە مۆرکرا. هەندێ لەماددەکانی پەیمانەکە پەیوەندیان بە کێشەی موسڵەوە هەبوو برگەی دووەم لەماددەی سێیەمی پەیمانی لۆزان هێڵی سنووری نێوان تورکیاو عێراقی دیاری کرد بوو بەرێکەوتنێکی برایانی نێوان تورکیاو بەریتانیای مەزن لەماوەی ٩ مانگدا

ئەگەر لەماوەی دیاری کراودا نەگەیشتنە ئەنجامێك کێشەکە بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرز دەکرێتەوە)[١٤].

تا ئێستا چەندان لێکۆڵینەوەی زانستی و وتار سەبارەت بەدروست کردن و دامەزراندنی عیراق نوسراوە بەتایبەتی لەساڵی ١٩١٨ وەتا کێشانی سنوری وڵاتەکەو یەکلاکردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ لەنەتەوە یەکگرتوەکاندا دیارە لەنێو ئەو لێتوێژینەوەو وتارانەدا هێشتا کتیبەکەی د.فازیل حسێن- کێشەی ویلایەتی موسڵ هێزی خۆی لە دەست نەداوەو هەر بۆیە پێویست ناکات هەمو ئەو کۆبونەوەو دیدارانە باس بکەین کە بۆ چارەسەری کێشەی ویلایەتەکە گرێدراون چونکە کتێبی ناوبراو زنجیرەیی ڕوداوەکانی بە وردی ڕیز بەند کردوە، ئەوەی گرنگە هەڵدانەوەی زیاتری تەلەگراف و نامەی ژەنەراڵە سەربازی و سیاسیەکانی دەوڵەتی بەریتانیاو فەرەنساو تورکیایە کە ڕۆژانە لە مەیدانەکانی کارەوە واتە لە عیراق و دەوروبەری بۆ ناوەندی بڕیارەکانی وڵاتانی خۆیان ناردوە، ئەوەی تائێستا بینراوە ئەو بروسکانە کۆمەڵێك حەقیقەت دەگێڕنەوە کە بۆ ئێمەی کورد جێگای سەرنج و گرنگی پێدانن بە تایبەتیش سەبارەت بەرێژەی کورد لەویلایەتەکەدا، ئێستا وەك بەڵگە تەنیا یەك بەڵگەی نهێنی لەو بەڵگانە دەنوسینەوە.

**بەڵگە نامەی نەهێنی**

ژمارە٨٦/٣٨ (C.0730) ڕۆژی ١٩٢٥/١٢/٥

لە (سیر د.لیندسای)یەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە

بابەت- پەیوەندی نێوان سنوری تورکیاو عیراق

گەیشتومەتە ئەو باوەڕەی کە لەگەڵ تورکەکاندا دەربارەی سنوری تازەی عیراق لەگەڵ تورکیادا، ناگەینە هیچ ئەنجامیك، لەبەر ژمارەی زۆری ئەو کوردانەی کەلەم دیوی سنوری تورکیاوەیە لام وایە ئەم کێشەیە دەبێتە هۆی گیروگرفتێکی هەمیشەیی لە نێوان بەریتانیای گەورەو تورکیادا مەگەر تەنها عصبە الامم بتوانێت بڕیارێك دەربکات لەم ڕووەوە چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، وا پێشنیاز ئەکەم کەواز لەو ناوچە شاخاوییانە بهێنرێت کە ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئەو هێڵەی عەمادییە-سلێمانی بەمەرجێك ناوچەی سلێمانیش بگرێتەوەو هەمووی بدرێت بە ئێران .

ئەو ناوچانەش کە لە ژووروی عێراقدا گوزەران دەکەن دەتوانرێ بخرێتە سەر ئەو کوردانەی کە لە ڕۆژئاوای ئەو هێڵەدا دەمێننەوە. وابزانم ئەم وازهێنانە تاببێتە هۆی زویربوونی تورکەکان بەم هەنگاوە ڕێگە لەزۆر گلەیی و بۆڵەیان دەگیرێت.

خۆئەگەر هاتوو ئەم پێشنیازەش پەسەند نەکرا و بەباش نەزانراو خرایە پشت گوێ‌و بەدەم کوتکردنی تورکەکان دەتوانرێ ئەو ناوچانەی دەکەونە سەرووی ڕەواندزەوە- یەعنی لەسنووری تورکیاوە هەتا ڕەواندز بدرێ بەتورکیا، بەبیانووی ئەوەی کە عەشایری نیشتەجێی ئەو ناوچانە پەیوەندییان هەیە بەو عەشایرە کوردانەی ترەوە کە لەناو سنوری تورکیادا دەژین-ئەوە یەکێکە لەوبڕو بیانووی هەمیشەیی تورکەکان کە داوای ویلایەتی موسڵ دەکەنەوە- لەلام وایە بەشە تورکەکان بێدەنگ دەکرێن‌و چارەسەرێك دەدۆزرێتەوە بۆ کێشەی سنوور. بەڵام پێویستە لەگەڵ ئێرانییەکاندا بڕیاری ئەوە بدرێ کە نابێ ئەو بەشەی دەیدرێتێ بەهیچ جۆرێك بیدا بەعێراق یابە تورکیا.

بێگومان ئەگەر ئەمە کرا ئەوە حکومەتی تورکیا ئەمە بەڕێکەوتنێك دادەنێ کە بەشێك ئەبێ لەو ڕێکەوتن نامەیەی کەلە-جنیف-دا ساز کرا.

بەلای منەوە ئەمە پێشنیازە باشترین شتە کەبیری لێ بکرێتەوەو ئەنجام بدرێ چونکە شتێکی زۆر گرنگە بۆ پەیوەندی نێوان ئینگلترەو تورکیا وەلام وایە ئەبێ ڕەددی فیعلی عێراق‌و ئێران لەم ڕووەوە بخرێتە پشت گوێ[١٥]

ئەمە یەکێکە لەو سەدان بروسکەو تەلەگراف‌و نامە نهێنیانەی کە دەکرێت بۆ لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی‌و نووسینەوەی مێژووی نەتەوەکەمان سوودیان لێ وەربگرێت.

هەر لەپێناوی دەوڵەمەند کردنی ئەو بیرو ڕایانەی سەبارەت بەکێشەی موسڵ کراون، بیرو ڕای مێژوو نووسی یوگسلاڤ پرۆفیسۆر(رادوڤان پاڤیچ) دەنووسینەوە کە لە

سالّی (١٩٧٠) لە دوو توێی لێکۆڵینەوەیەکدا بەناوی (جوڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد لە خەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی و سیاسی) نووسیویەتی (ڕادوڤان) دەڵێت: (سێرریدەر پولارد- لە کتێبەکەیدا (بەریتانیا و ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست لە سەدە کۆنەکانەوە تا سالّی ١٩٥٢) ئەڵێت، لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا ئەگەر لەیادم نەچووبێت سالّە کە (١٧٧٢) گەڕیدەیەکی ئینگلیزی سەر لەویلایەتی موسڵ ئەداتو ئەچێتە شاری موسڵ، باسی دانیشتوانو پیشەو خووڕەوشتو گوزەرانیان ئەکات تا ئەڵێت:- زۆربەی دانیشتوانی ئەم شارە کوردن.. ئینجا بەتوتەی عەرەبیش ئەو ڕاستیەی بەم جۆرە دەرخستووە وئەڵێت: کەچوومە موسڵ (خەڵکەکەی بە زمانێك قسەیان ئەکرد کە عەرەبی نەبوو.. هەندێ خێزانیش گامێشیان بەخێو ئەکرد..) دیارە بەشەکانی تری کوردستان زۆر نمونەی وەکو موسڵیان بەخۆوە بینیووە- زۆر کەسیش باری دوێنێی نزیكو ئەمڕۆی شارو شارۆچکەکانی ڕاستەخەت، جۆرە تێکەڵاوییەتی دانیشتوانی لەبەر چاوە، هەر لەخانەقینو شارەبانو جەلەولاو توزخورما تۆوە وەتا کەرکوكو ئینجا بەرەو شێخان شەنگار...هتد- ئەزانن چۆن لەماوەیەکی کورتدا زۆر شت گۆڕاوە.. زۆر نەخشە جێبەجێ کراوە، ئەگەر شۆڕشی نوێی دوای هەرەسی (١٩٧٥)یش نەبووایە، زۆر زیاتر ئەنجام ئەدراو زۆر گۆڕانی تر ئەکرا)[١٦].

ڕادۆڤان کێشەی یەکلاکردنەوەی ویلایەتی موسڵ بەبوونی نەوت گرێدەدات هەر بۆیە کێشانی سنوورەکە بەم شێوەیە باسکردووە:(ئەوەی پێویستیش بێت لێرەدا باسی بکەین مەسەلەی سنووری عێراقە کەلەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی جێگیرکرا چونکە پەیمانی لۆزان ئەم مەسەلەیەی بەکراوەیی بەجێ هێشت، چارەسەر کردنەکەشی بەلیژنەیەك سپارد کە-عوسبەتولئومەم- پێکی بهێنێت، واش چاوەڕوان ئەکرا ئەو مشتومڕەی لەسەر مەسەلەی نەوتی موسڵو کوردستان ئەکرا بەلایەکدا بیخاتو چارەسەری بکات، ددان بەمافی کورد دابنرێت لەو نەوتەدا، لەدوایشدا هەوییەی تایبەتی کورد سەر لەنوێ بسەلمێنرێتەوە، وبەڕوونی دەربخرێت کە نەفارسو نە تورکو نە عەرەب.

بۆ تێگەیشتنو چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد پێویست بوو- عوسبەتولئومەم- ڕای ئەو لیژنەیەی خۆی پێکی هێناو سەری لە کوردستان داو لەدوایشدا ڕاسپاردەو پێشنیارەکانیشی خستە بەردەم عوسبە خۆی وەربگرتایە، کە بریتی بوون لە دامەزراندنی دەوڵەتی تایبەتی کوردستان بەلاّم ئەوە نەکرا ، دیارە هۆی کاریگەریش هەر دۆزینەوەی نەوتە زۆرەکەی ناو کوردستان بوو. بەوشێوەیە، وەبەپێی ڕێکەوتنی سالّی (١٩٢٦) لەنێوان بەریتانیای گەورەو تورکیاو عێراقدا، ئەو سنوورەی ئیستا کەلە ئارا دایە بڕیاریان لەسەر داو چەسپێنرا)[١٧].

زۆربەی وڵاتە زلهێزەکان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کەچارەسەری ویلایەتی موسڵو دیاریکردنی سنوری سەروی وڵاتەکە ببرێتە بەردەم ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، خوێندنەوەی هەر یەکێك لەو وولاّتانە بەتایبەتیش بەریتانیاو فەرەنساو تورکیا جیاوازی هەبوو، لەبەر ئەوە چەندان لیژنەی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون پێکهاتوو چەندان جار لیژنەکان سەردانی عێراقو تورکیاو بەریتانیایان کردو کەوتنە گفتوگۆو کۆکردنەوەی بیرو ڕاو گەڕانو پشکنینو گوێگرتن لەبۆچوونی خەڵکی ناوچەکە، واتە خەڵکی ویلایەتی

موسڵ، لەهەمووی گرنگتر کەبەنەزەری ئیعتباریان وەرگرت جوگرافیایی ناوچەکەو سەرژمێری دانیشتوان و نەتەوەکان بوو، ئەمەو بێجگە لەوورد بوونەوە لە بەڵگە مێژووییەکان بەڵام وەنەبێت گەمەسیاسی و ململانێکان بەپەراوێز خراب و گرەویان لەسەر نەکرابێت، پاش ئەوەی ڕێککەوتنی دووقۆڵی لە نێوان بەریتانیا و عێراقییەکان لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٢) مۆرکراو چەندان گفتوگۆی ڕەسمی و ڕێککەوتنی تر لەنێوان بەریتانیا و عێراقییەکان کراو ئیمزا کراو پرۆژەی ئینتیدابی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە جێ لەق دەبووو ڕێخۆشکەر بوو کەلەماوەی دیاریکراو زووتر عێراق بتوانێت داوای ئەندام بوونی بکات لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا، چونکە لەو حاڵەتەدا کاری بەریتانیا لە عێراق کۆتایی پێدەهات لەو نێوەندەشدا دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ و کێشانی سنووری عێراق- تورکیا باشتر کاری بۆدەکرا ئەوەبوو سەرەتا هێڵێکی کاتی کێشرا کەبەهێڵی برۆکسل ناسراوە.

دیارە لیژنەکان هاتنە ناوچەکەو دەستیان بەکۆکردنەوەی زانیاری کرد، سەرەتا گفتوگۆیەکی گەرم سەبارەت بەناوی عیراق کراو لەو ڕووەوە پێم باشە چەندپەرە گرافێك لەکتێبی (کێشەی ویلایەتی موسڵ). بگوازمەوە.

سەبارەت بەناوی عێراق، تورکیا ڕای وابوو کە ویلایەتی موسڵ بە بەشێك لە عێراقی عەرەب -ناژمێردرێت، بەڵکوبەشێکە لە- جەزیرە- لەڕێکەوتنی سایسکس- بیکۆدا موسڵ و عێراق جیاکراونەتەوە هەروەها لەداخوازییە تایبەتیەکانی- شەریف پاشادا لەبارەی کوردستانەوە ساڵی (١٩١٩) کە لەسەر داخوازی هاوپەیمانەکان پێشکەشی کرد. موسڵ جیا لە عێراق باس کراوە. هەروەها دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆیان بە بەشێك لە عێراق نەزانیوە. بۆ سەلماندنی رای خۆی دەربارەی پێناسەکردنی عێراق و حکومەتی تورکیا سوودی لە هەندێ برگەی-دائره المعارف-ی بەریتانی و دائره المعارف-ی فەرەنسی وەرگرتووە لە لایەکی دیکەوە حکومەتی بەریتانیا رایگەیاند کە هێزەکانی بەریتانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی دا هەموو -میزۆپۆتامیای داگیرکردووەو ناوی عێراقیش لە کۆنەوە بە هەموو وڵاتەکە گوتراوەو دانیشتوانیشی بەو ناوەیان ناسیوە.

ناوی عێراقی نوێ لە- عەجەم-و عیراقی عەرەبەوە- هاتووە کەلە کۆتایی سەدەی یازدەهەمدا بەکار هێنراون، عێراقی عەجەم بەشێکە لەئێرانی ئێستا و بەشێك لەویلایەتی موسڵ دەکرێتەوە. دەربارەی ئەم مەسەلەیە حکومەتی بەریتانیا ئاماژەی بۆ بڕیارێکی دەزگای تورکیا کردووە کە لە ڕۆژی (٥)ی سەفەری (١٣١٠)ی کۆچی بەرامبەر (١٦)ی تشرینی دووەمی (١٩٠٨) هاتووە. شارەزوور بەشێکە لەعێراق و ئەم ناوچە ئیدارییە کەبەشارەزوور ناسراوە کەرکوك و ڕانیەو هەولێرو ڕەواندوزو کفری و کۆیە دەگرێتەوەو هەموو ئەوانەش لەویلایەتی موسڵدان.

حکومەتی بەریتانیا بۆ سەلماندنی ڕاکانی خۆی باسی نەخشەیەکی کرد کەنوێنەری تورکیا لە ساڵی (١٨٤٨) لەئەرزەرووم پێشکەشی لیژنەی دیاری کردنی سنوری ئێران و تورکیای کردووەو لە نەخشەکەدا نیشان دراوە کە ڕەواندوزو هەولێرو سلێمانی دەکەونە ویلایەتی بەغداوە کە ئەو کاتە هاوسنووری ویلایەتی وان بوو.

لیژنەکە پاش بیستنی ڕاو بۆچوون و سەرنجی جیاوازی هەردوولا ناچار بوو بەووردی لەبابەتەکە بکۆڵێتەوەو دیراسەی بابەتەکە بکات و بۆ ئەو بەڵگە ئەدەبیانە بگەڕێتەوە کەپەیوەندیان بەناوی عێراقەوە هەیە. لیژنەکە پێی وابوو مەسەلەی ناوی عێراق شایانی ئەو هەموو بایەخ پێدانەیەو ئەنجامی لێکۆڵینەوەی خۆی لەچەند پرسیارێکدا دەربڕی وەکو:

١. ئەو ناوچانە کامانەن کەئەمڕۆ بەعێراق یان عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەم ناسراون؟

٢. ئەو ناوچانە چین کەدراونەتە پاڵ ناوچەی- ململانێ- یاخود بەشێکە لەو ناوچانە؟

٣. ئایا ناوی عێراق ناوێکی ناوخۆو ناسراوو ئاشنا بووە؟

٤. میزۆ پۆتامیا بەکام ناوچەی هەموو وڵاتەکە گوتراوە؟

بۆ گەیشتن بەئەنجام لیژنەکە گەڕایەوە سەرمێژوو نووسان و جوگرافی زانەکانی کۆنی عەرەب هەروەها سوود لە ژمارەیەك نەخشەی عەرەبی و سەدان نەخشەی سەردەمی شانزەو سەدەی بیستەم وەرگیرا کە لە ئەوروپا ئامادەکراون. هەروەها سوودیان لە کتێبەکانی گەشت و سیاحەت نامەی هەموو سەردەمەکان و کتێبەکانی جوگرافیای دواناوەندی قوتابخانەکانی میسر وەرگرت کە بە زمانی عەرەبی نووسراون.

سەرنجام لیژنەکە گەیشتە ئەوەی کەسێ ناوچە ناسراون ئەوانیش:- عێراقی عەرەب، الجزیرە، کوردستان- سنووری عێراق لە باکورەوە هیت و تکریت و زنجیرە چیاکانی -حەمرین- تێپەڕ ناکات. دڵنیانەبوون کەبەشێکی ناوچەی ململانێ ڕۆژێ لە ڕۆژان بەشێك نەبووە لە عێراقی عەجەم.

لە هەموو ئەدەبیاتی جوگرافیادا هەر لەسەردەمی داگیرکردنی عەرەبەوە تاکاتی لێکۆڵینەوەی لیژنەکە لە ساڵی (١٩٢٥)دا ناوچەی ململانێ نەباسکراو نەبەبەشێك لەعێراق دانراوە. لای دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ ناوی عیراق نائاشنا بووە. بەڵام بۆ عەرەبی عێراق ناسراو ئاشناترە لەووشەی میزۆ پۆتامیای ئەورووپی- میزۆ پۆتامیابەشی ڕۆژئاوای ناوچەی - ململانێ- دەگرێتەوە. ئەوەی حوکمەتی تورکیا باسی دەکات کەویلایەتی موسڵ بەشێك بووە لە ئەنادۆڵ- لیژنەکە پێی وایە ڕاست نییە، هەردوو ناوچەکە واتە- ویلایەتی موسڵ و ئەنادۆڵ- کوردستانی ڕۆژئاواو سوریا دەکەونە نێوانیانەوە[18].

لەم چەند پارەگەرافەی پێشەوەدا دەتوانرێت چەند حەقیقەت و ڕاستی یەك دەست نیشان بکرێ بۆ نمونە ناوی عێراق، جەزیرە، کوردستان کەهەر یەکێکیان خاوەنی سنوورو جوگرافیای تایبەت بوون، عێراقی عەجەم و عێراقی عەرەب بەهەمان شێوە دووناوی جیاوازن بۆ دوو شوێنی جیاواز، ئەمە و بێجگە لە میزۆپۆتامیا، ئەو چوار پرسیارەش کە لەشێوەی چوار خاڵدا جیاکراوەتەوە دەکرێت بۆ ڕۆژگاری دوایی ڕووخانی ڕژێمی سەدام حوسێن یش واتە دوای ٢٠٠٣/٤/٩سودیان لێ وەربگیرێت و جارێکی تر بوروژێنرێن، ئەگەر ووردتریش لەپرسەکان بکۆڵینەوە ئەو ئەنجامەیە کە لیژنەکە پێیگەیشتووەو ئەویش سێ ناوچەی ناسیوە بەناوی عێراقی عەرەب، جەزیرە،

کوردستان، بەڵام پرسیاری سەرەکی ئەمەیە ئەی بۆچی هەموو حەقیقەتە جوگرافی و سەر ژمێرە نەتەوەیەکان پشت گوێ خران و پەرژەوەندیەکانیان پێشێلی مافی نەتەوەی کوردی کرد کە لەو سێ ناوچەیەدا کە ئاماژەیان پێدراوە لە دوو ناوچەیاندا گەورەترین ڕێژەی دانیشتوانی کوردن لە هەموو ڕویەکەوە پێویست بوو پێش چارەسەری ویلایەتی موسڵ مافی نەتەوەیی بەکورد بدرێت و ئەوسا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کێشەی ویلایەتی موسڵ چارەسەر دەکرا.

دوای ئەوەی بڕیاردرا چارەسەری ویلایەتی موسڵ لە ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاری بۆ بدرێت، چەندان لیژنە بۆ ئەم مەبەستە پێکهات و دەیان کۆبونەوەو یەکتر بینین و گەشتی مەیدانی لێکەوتەوەو لە کۆتاییدا لیژنەکە وای بینی:

١-ئەم سەرزەمینە بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لەژێر ئینتیدابی بەریتانیا بمێنێتەوە.

٢-بایەخ و گرنگی بدرێتە ویستی کوردەکان بەدانانی کاربەدەستی کورد لە دادگاو قوتابخانەکانداو زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێت.

لیژنەکە ئەوەشی دەربڕی کەئەگەر لەگەڵ تەواوبونی پەیمانی عیراق- بەریتانیا ئینتیدابەکەش کۆتایی پێ بهێنرێت و کوردەکان هەندێ ئەمانەتیان نەدرێتێ لەڕووی بەڕێوەبردن و تایبەتمەندی خۆیانەوە زۆربەیان دەسەڵاتی تورکیا یان دەسەلاتی عەرەبی پێ باشتر دەبێ و گیروگرفتی سیاسی مەترسیدار دێتە پێش، بەڵام وەك دەزانرێت خەریك بوو کێشەی ویلایەتی موسڵ کۆتایی دەهات لە کوردستانی باکور شۆڕش هەڵگیرساو تا ئێستاش چەند ڕایەکی پێچەوانە سەبارەت بەکات و شوێنی جاڕدانی شۆڕشەکە کراون و بڵاوکراونەتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی دروست و زانستی نەتوانراوە قەناعەتێ بڵاوبکرێتەوە کە بەریتانیا لەپشتی ئەو شۆڕشەوە بوە تا هەڵوێستی تورکیا لاواز بکات بۆ پاشگەز بونەوە لەداواکردنی ویلایەتی موسڵ لەبەرئەوەی زەمینەسازی لە کوردستانی باشور بۆ بەریتانیا ئاسانترو لەبارتر بوو بۆ یەکدەنگی و یەك هەڵوێستکردنی کورد لەپاڵ داواکانی بەریتانیادا، ئەگەر بەریتانیا لەپشتی شۆڕشەکە بوبێت چۆن لەکاتی هێرشە شۆفێنیەکانی تورکیا بۆ سەرشۆڕشگێڕان لابەلا کێشەی بۆ تورکیا دروست نەدەکرد و لەبەرەی ترەوە شەڕی سەربازی یان ئابوری بەرامبەری دانەمەزراند خالی هەرە لەپێشینەی بەرپابونی شۆڕشەکە سیاسەتی شۆفێنیانەی تورکیاو جوڵانی هەستی نەتەوایەتی و سیاسەتی تێکدەرانەی تورکیا بوە بەرامبەر بەیەك دو پەیمانی دەولی کەباسیان لە مافەکانی گەلی کورد دەکرد، هەروەها ڕۆژگارەکەش وای دەخواست کەلەکوردستانی باشوریش بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە باشترو ڕوبەڕوو بەئاشکرا بێتە مەیدانەکەو لەشۆڕشی شێخ مەحمودی بەرزنجی و بزوتنەوەی چەکداری سمکۆ لەکوردستانی ڕۆژهەلات دانەبڕیت و کە هەرسێ لایان بەهیوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی خەباتیان دەکرد.

جا من وای دەبینم کە هەڵگیرساندنی شۆڕشی ١٩٢٥ هیچ پەیوەندی بە سەرهەڵدان و یەکلاکردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵەوە نەبوە.

پێش ئەوەی ئەنجومەنی نەتەوەکان بڕیار لەسەر یەکلاکردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ بدات سەرەتا دوڕێگا چارە خرایە ڕوو:

١-هەمو ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە باشوری هێڵی برۆکسلەوە بخرێتە پاڵ عیراقەوە.

٢-دابەشکردنی ئەو ناوچەیەی ناکۆکی لەسەر هەیە بەهێڵێك کە پتر لەگەڵ زێی بچوك دەڕوات[١٩].

هەروەکو لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا کە کێشەکە کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز بوو بۆ وڵاتە زلهێزەکانیش ڕێگا چارەی دوەم باش هەرس نەدەکرا، هەربۆیە ئەندامانی لیژنەکە دوای ڕاوێژو ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ ناوەندەکانی بڕیار لەوڵاتەکانیان ڕێگا چارەی یەکەمیان هەڵبژاردو ڕۆژی (١٦)ی کانونی یەکەمی ١٩٢٥) لیژنەکە ئەم چوار خاڵی خستە بەردەم ئەندامانی ئەنجومەنی نەتەوەکانو ئەوانیش دەنگیان بۆدا:

١-پێویستە هێڵی بڕۆکسل ببێتە هێڵی سنوری نێوان تورکیاو عیراق.

٢-پێویستە حکومەتی بەریتانیا ئاگادار بکرێتەوە بۆ پێشکەشکردنی پەیمانێکی تازە لەگەڵ عیراق کە بەردەوام بونی سیستەمی ئینتداب بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ دابین بکات، وەکو لەڕێکەوتنامەی هاوکاری نێوان بەریتانیای مەزنو عیراقدا دیاری کراوەو هەروەها ئەو بەڵێنەی حکومەتی بەریتانیا کە ئەنجومەن لە٢٧ی ئەیلولی ١٩٢٤ داپەسەندی کرد بەو مەرجەی بەپێی خاڵی یەکەمی پەیڕەوی کۆمەڵە، عیراق تا کۆتایی ئەو ماوەیە لە کۆمەڵەدا وەرنەگیرێت هەر کاتێکیش لەماوەی شەش مانگدا، لە١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٢٥-ەوە ئەنجومەن ئاگادار کرایەوە لە جێبەجێکردنی ئەو مەرجە، پێویستە ئەنجومەن ڕایبگەیەنێ کە بڕیارەکەی کۆتاییەو هەنگاوی پێویست بنێت بۆ مسۆگەر کردنی دارشتنی هێڵی سنور بەسەر زەویدا.

٣-پێویستە حکومەتی بەریتانیا ئاگادار بکرێتەوە بۆ ئەوەی بەرنامەی پێویستی دابینکردنی مافە ئیدارییەکانی کورد پێشکەش بە ئەنجومەن بکات.

٤-پێویستە حکومەتی بەریتانیا ئاگادار بکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕاسپاردە تایبەتیەکانی لیژنەکە جێبەجێ بکات[٢٠].

بەو شێوەیە ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان بەتێکڕایی دەنگ ڕاپۆرتی لیژنەی چارەسەرکردنی ویلایەتی موسڵ واتە کێشانی سنوری نێوان تورکیاو عیراقی پەسەند کرد .

لە کۆتایی گێڕانەوەی ئەو ڕوداوەدا کەبەشێکە لە زنجیرە ڕوداوێکی بەیەکتر گرێدراو شیاوترە بەبیرو بۆچونی د.کەمال مەزهەر ئەحمەد بابەتەکە دەوڵەمەندتر بکەین لەباسێکدا بەناونیشانی (دەربارەی هەڵوێستی نەتەوە پەرستانی عەرەب بەرامبەر بە مەسەلەی کورد) دەڵێت: نەتەوە پەرستانی عەرەب بەڵکو عەرەب هەرهەمویان زیاتر پێویستیان بەوەبو دڵنیایی کورد بکەن، چونکە دیاریکردنی چارەنوسی ویلایەتی موسڵ لەسەر هەڵوێستی ئەوان وەستا بوو، کۆمەڵەی نەتەوەکان لیژنەیەکی تایبەتی دروستکردبو بۆ توێژینەوەی ئەو کێشەیە ئەو لیژنەیە هات بە هەمو شارەکانی کوردستانی عیراقدا گەڕاو دیدەنی لەگەڵ خەڵکەکەدا کردو ڕاو بۆچونیان هەموی کرا بە ڕاپۆرتێکی دورودرێژی بایەخداری گەورە، کە پێموایە دەبێت هەمو خوێنەرێکی کورد لە نزیکەوە ئاگاداری ناوەڕۆکی ئەو ڕاپۆرتە بن، کورد لەو ڕۆژگارەدا هەڵوێستێکی یەکجار جوامێرانەی هەبوە، هەر کەسێك کەلێیان پرسیوە لەپێش هەمو شتێکدا داوای مافی نەتەوەی کوردیان کردوە،هەمویان وتویان، ئێمە دەمانەوێت دەوڵەتمان بۆ دابمەزرێنن، دەمانەوێت بەندی ٦٢-٦٣-٦٤ ی پەیمانی سیڤەر بچەسپێت بەڵام ئەگەر هاتوو ئەوە نەکرا ئەوە بەلامانەوە پێویستەو

بەباشی دەزانین لەگەڵ عیراقدا بین بە مەرجێك دەبێت عیراق دان بەهەمو مافە نەتەوەییەکانماندا بهێنێت، بەهیچ جۆرێك نامانەوێت لەگەڵ تورکیادا بین.هەر لەو باسەدا درێژە بەقسەکانی دەدات و بەم شێوەیە باس لەهەردو کەسایەتی و دیارە عەرەبەکانی ناو موسڵ دەکات و دەڵێت: سەرۆکانی هۆزی عوبێدو سەرۆکانی هۆزی جبورو گەلێك بنەماڵە ناسراوەکانی ناو شاری موسڵ وەك جەماعەتی ئاغایانی - باب البیض- ئەوانەی کەلە ئەرستۆکراتی شاری موسڵن، هەموویان دەنگیان داوە کە ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر تورکیا لە راپۆرتەکەی عصبە الامم دەقاو دەق نوسراوە دەڵێت، هەرگیز چاوەروانی ئەوە نەبووین کەوا ژمارەیەکی وا زۆر لەو عەرەبە ناسراوانە بێن دەنگ بۆ ئەوە بدەن کەوا ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر تورکیا، ئینجا دێتە سەر دەنگدانەوەی هەڵوێستی کورد لە رۆژئاوادا، هەڵوێستی جوامێرانەی کورد لەرۆژئاواشدا دەنگێکی زۆری دایەوە، رۆژنامە هەرە گەورەکانی رۆژئاوا وەکو- تایمزی لەندەنی - زانا هەرە گەورەکانی رۆژئاوا وەك - ئارنۆڵد توینبی- بە درێژی لەو رۆژانەداو بە دەیان جار باسی ئەو هەڵوێستەی گەلی کوردیان دەکردو باسی ئەوەیان دەکرد کە عێراق قەرزاری گەلی کوردە چونکە بەو کردەوانەی توانیی ویلایەتی موسڵ بۆ عیراق بپارێزێت[٢١].

بەڵام ئەگەر پێشینەی ئەودیوی پەردەکان سەبارەت بە جارێکی تر داڕشتنەوەی نەخشەی جیهان لێك بدەینەوە کە لە پلانی هەڵگیرساندنی شەڕی یەکەمی جیهان سەرچاوەی گرتووە، (هۆی هەرە گەورەی شەڕی یەکەمی جیهان تەماعی دەوڵەتە گەورەکان بوو بۆ دابەشکردنەوەی جیهان، سەرتاپای ئەو دەوڵەتانەش چاویان بڕی بووە خاکی ئیمپراتۆری عوسمانی و بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی میراتەکەی بوون. تەنانەت ئەڵمانیای هاوپەیمانی تورکیا خۆیشی کەمتر لە دەوڵەتەکانی تر بۆ ئەو میراتە بە پەرۆش نەبوو، لەبەر ئەوە دەوڵەتە گەورەکان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا بە تاك و بە کۆمەڵ خەریکی پلان دانان و پیلان گێڕان بوون بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستانەیان کە بوونە هۆی شەڕ. دیارە کوردستانیش وەك بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانی جێگەیەکی دیاری لەو پلانانەدا هەبوو)[٢٢].

لەو گەمەیەدا دەکرێت گلەیی لەسەرکردەو کەسایەتی یە دیارەکانی ناو مێژووی ئەو سەردەمەی کوردستان نەکرێت چونکە کورد یاریکەری یەدەگی نێو گۆرەپانەکانی یاریکردن بووە، هەروەها مەودای بیرکردنەوەی بزوتنەوەی کوردەواری زیاتر بەلای خەباتی چەکداریدا گەڕاوەو لە سیاسەت و سیاسەتکردندا شارەزاو وریا نەبووە، هۆکارەکانی ئەو دواکەوتنە زۆرن، لەتکردنی کوردستان، ئاستی خوێندەواری، نەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆ، رۆژئاوای دەسەڵاتداریش لە کۆنەوە کورد بەفاکتەرێکی چالاك و زیندووی بەلادا کەوتنی هاوکێشە گرانەکان نەزانیووە، لەو ڕووەوە زۆر کات کێشەی کوردی بەپەراوێز خستووە و لەنێو فایلە گەرمەکاندا دەریهاویشتووە، تا گەلێك جاریش لە جیاتی کورد وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوە.

خاڵێکی تری بەرچاویش هەڵکەوتەی جوگرافیای کوردستانە کە کەوتۆتە بەر ماشێنی جەنگی چەند نەتەوەیەك کەلە دێر زەمانەوە پیلانیان بۆ لەناو بردنی کورد گێڕایەوەو فشاریان بۆ وولاتانی زلهێز بردووە کە بارودۆخی کوردستان دەستکاری نەکرێت تا هەنگاوی پێشکەوتوو نەنێت، هەڵس و کەوتی تورك و عەرەب و فارس

لەبنەمای بیرکردنەوەو کردارياندا هەڵس و کەوتێکی شۆڤینیایەو ڕاسیستانەیە بەرامبەر بەنەتەوەی کورد، چەندان جار پیلانی جینۆساید کردنی کوردیان داڕشتووە، تا تەبایی نێوخۆی کوردیش هۆکاری تری پاشەگەردانی نەتەوەییمانە.

بەخوێندنەوەو پێداچونەوەی ئەو بیرو بۆچونانەی پێشەوە هەستدەکرێت کە گەمەیەکی سیاسی گەورە لە پشتی ئەو ڕاپرسە بوە کە بەریتانیا مەبەستی بوەو تورکیاش وەك پاشماوەی ئیمپراتۆریەتێکی نەخۆش هەر زو هەستی بەدۆڕاندنەکە کرد بوو، بۆیە نمونەی خوێندکارێکی تەمەڵ بو خۆی لە کۆبونەوەو گفتوگۆکاندا دەدزییەوە یاخود خاوەنی دوا بڕیاری یەکلاکردنەوە نەبو، هەر دوو لایان لەبونی کورد دەترسان چونکە ئەو مەیدانەی کە قەڵاکەی دەڕوخا، لە ناوچەی ململانێکە بۆ کوردستانە، بەریتانیا دەیتوانی داخوازییەکانی کورد جێبەجێبکات و ئەوەندە حساب بۆ دڵنەوایی تورکیا نەکات و گرنگی بەگەرمکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ فەرەنسا بدات ئەوسا مەزنایەتیەکەی باشتر بۆ پێشەوە دەچوو، کورد زیرەکانە هەڵوێستی وەرگرت بەڵام نەیزانی هەڵوێستەکەی ئیستغلال دەکرێت ئایا بەریتانیا بۆ تائێستا لەسەر ئاستێکی واقیعی و ئەکادیمی وەڵامی ئەوەمان ناداتەوە بۆ هەوڵی نەدا ئەو ڕۆژگارە لە (١٩١٨-١٩٢٥) دەوڵەتی کوردی هەر هیچ نەبێت لەکوردستانی باشور ڕابگەیەنرێت کە بارودۆخی لە پارچەکانی تر شیاوتر بوو؟ کورد زۆرینەی ویلایەتی موسڵ بووە، ئەوەی بە ئاسایی وەرنەگیراوە سەنتەری شاری موسڵ بوە کە ڕێژەیەکی زۆر عەرەبی تیابووە، ئایا نەدەکرا هەموو ویلایەتەکە بکرێتە دەوڵەتی کوردستانی باشورو ئەو چەند هەزار عەرەبەی ناو شاری موسڵ وەك کەمە نەتەوەیەك لە کوردستان بژین و مافەکانی ژیان و کلتوریان پارێزراو بێت؟ من دڵنیام ئەگەر ئەوسا بەریتانیا کاری بەو پلانە بکردایە زۆر لەهۆزە عەرەبەکانی ناو موسڵ دەنگیان بۆ هاوژیانی لەگەڵ کوردا دەدا بەهەڵدانەوەی وردتری دۆکیومێنتەکانی بەریتانیاو سەیرکردنی باری ڕۆژنامەگەریی ئەوسا لە موسڵدا زۆر قسەو باسی تر دەورووژێن و ڕای گشتی کوردو عەرەب و تورك و بەریتانیامان باشتر بۆ ڕون دەبێتەوە، تۆ بڵێیت فشاری تورکیا ئەوەندە بەهێز بێت لەسەر بەریتانیا تالەهەمو پەیمانەکانی کە بە کوردی دابو پەشیمان بێتەوە؟! بێجگە لە پەیمان و ڕێکەوتنامەکان فەرمون باسەیری مادەی ١٦ لەسیستەمی ئینتیدابی بەریتانیا بکەین: (هیچ شتێك لەم ئینتیدابەدا لەبەردەم مونتەدەبدا ڕێگر نییە کەلەڕوی ئیدارییەوە لەناوچە کوردییەکاندا حکومەتی سەربەخۆ دابمەزرێنێت)[٢٣] لەوە دەچێت لەڕاپرسەکەی کۆمەڵەی نەتەوەکانیشدا کورد هەر بەو حەماسەتە کاری کردبێت و نەیزانیبێت ئەمە سیاسەتی سەرکردنی بەریتانیای مەزنە!

پێم گونجاوە لە کۆتایی ئەم بەشەدا ئەم حیکایەتەی ئەولیا چەلەبی بنوسمەوە: (کەشتی نوح لەپاش گەڕانێك بەسەر ئاودا دو قۆناغ لەلای باکوری شەنگار و لەنێوان قەڵای موسڵ و نەسیبین دا لەسەر کێوی جودی گیرسایەوە ئەوانەی تێیدا بون هاتنە دەرو سوپاسی خوایان کرد، چێشتیان لێنا خواردیان و ئەو چێشتەیان ناونا چێشتی عاشور چونکە ڕۆژی دەیەی محەرەم بو، لە ڕۆژی تۆفانەوە تاهاتنە دنیای پێغەمبەری ئیسلام. بەقسەی محەمەدی کوڕی ئیسحاق -٤٤٩٠ ساڵەو لەزەمانی باب ئادەمەوە

تاهاتنی پێغەمبەر ٦٧٥٠ ساڵ تێپەڕیوە. ئەم قسەیە هەمو مێژو نوسەکان لەسەری یەکدیگیرن.

لەسەردەمی نوح پێغەمبەردا ئێرە بووە شارێکی گەورەی ئاوەدان و -کوردیم-ناوی ئۆمەتی نوح شای ئەم ناوە بووە، ئەم کوردیم شایە زۆر ژیاوەو گەلێك کوڕو نەوەی لێ کەوتۆتەوە زمانێکی تایبەتی بۆ خۆی ڕێکخست کە نە فارسییەو نە عەرەبییە، ئەم زمانە لەو سەردەمەوە ماوە، پاشان نوح پێغەمبەر لەجودییەوە سەری شەنگاری داو دوعای بۆ کرد کە ئاوەدان بێ)[٢٤].

# هونەرکاریی ڕۆژنامەگەریی
# بۆ کێشەی ویلایەتی موسڵ

ئەو دوو ڕۆژنامەیەی کەلەم کتێبەدا ئاماژەمان پێداون بریتین لە:
١- ئومێدی ئیستقلال ١٩٢٣-١٩٢٤
٢- ژیانەوە ١٩٢٤-١٩٢٦

**ئومێدی ئیستقلالی**

ڕۆژنامەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتماعی بووەو وەك لەژمارەکانی نووسراوە، غەزەتێکی ڕەسمییەو هەفتەی جارێك دەردەچێت، ژمارە (١)ی لە٢٠ی ئەیلولی (١٣٣٩)ی ڕۆمی کە بەرامبەر بە ساڵی (١٩٢٣)ی زاینیو ژمارە (٢٥) کە دوا ژمارەیە لە ١٥ی مایسی (١٣٤٠) کە بەرامبەر بە ساڵی (١٩٢٤)ی زاینییە دەرچووە، وەك دیارە ئۆرگانی حکومەتی ئەوسای کوردستان بووەو لە شاری سلێمانی چاپو بڵاوکراوەتەوە تەنیا چەند ژمارەیەکی کەمی گەیشتۆتە شارەکانی کەرکوكو بەغدا.
-لە ژمارە (١-٣) ئەحمەد خواجە مدیری مەسئولی بووە.
-لە ژمارە (٤-١٣) ڕەفیق حیلمی مدیری مەسئولو سەرنووسەری بووە.
-لە ژمارە (١٤-١٦) حسین نازم مدیری مەسئولو سەرنووسەری بووە.
-لە ژمارە (١٧-٢٥) ناوی کەسی وەك مدیری مەسئولو سەرنووسەر بە سەرەوە نییە.

**ژیانەوە**

ڕۆژنامەیەکی حکومی بووەو هەفتانە دەرچووە، ڕۆژنامەیەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری گشتی بووە، ژمارە (١)ی ڕۆژی دووشەممە (١٨)ی ئاغستوسی (١٩٢٤) دەرچووەو دوا ژمارەش کە ژمارە (٥٦)ە لە ڕۆژی پێنج شەممە (١٤)ی کانونی دووەمی (١٩٤٦) دەرچووە، وەك سەرنووسەرو دەستەی نووسەران ناوی کەسی بەسەرەوە نیە بەڵام ئەگەر بە وردی بابەتەکانی بخوێندرێنەوە دەزانرێت کە ئەم نەمرانە وەك سەرنووسەرو نووسەر هەر کەسەو لە ماوەی دیاریکراودا سەرپەرشتی دەرچوونی ڕۆژنامەکەیان کردووە وەك: (حسین نازم، جمیل صائب، م.ئەدیب، عەلی عیرفان) ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆژنامەی ئینگلیزەکان بووەو دوای ئەوەی لە ساڵی(١٩٢٤) هێرشیان کردە سەر دامو دەزگاکانی حکومەتی شێخ مەحموودو لە سلێمانی دوورکەوتەوە، ئینگلیزەکان ئەم ڕۆژنامەیان لە شوێنی ڕۆژنامەکانی شێخ مەحمود لە سلێمانی دەرکردووە، هەندێك کەس لەگەڵ ئەوەدا نین کە گرنگی بەم ڕۆژنامەیە بدرێت، بەڵام بە ڕای ئێمە یەکێکە لە

ڕۆژنامە پێشکەوتووەکانی ئەو سەردەمەو زۆربەی بابەتەکانی لە خزمەت مێژووی کوردو ئەدەبیاتی کوردیدا بووەو ئێمەش تەنیا وەك سەرچاوەیەکی تایبەت بە کێشەی ویلایەتی موسڵ سوودمان لێ بینیوە.

## سەرچاوەکان چ دەڵێن؟!

پێش ئەوەی لەو هەواڵو وتارانە وردببینەوە کە ئەو دوو ڕۆژنامەیە سەبارەت بە کێشەی موسڵ بڵاویان کردۆتەوە، کۆمەڵێك بۆچوون دەنووسینەوە کە پێش ئێمە لەو بابەتە دواون و دەرکیان بە گرنگی ئەو کێشەیە کردووەو لەو ڕۆژنامانەدا:

د.کەمال مەزهەر ئەحمەد (کێشەی موسڵ یەکێکە لەوبابەتانەی -ژیانەوە- بایەخی زۆری پێداوەو دەیان وتارو نووسینی هەمە جۆری دەربارەی بڵاوکردۆتەوە) بەرادەیەك هیچ چاپکراوێکی کوردی نییە لەوەدا بگاتە ئاستی ئەو، ڕاستە گەلێك هۆ لە ئارادا بوون بۆ ئەو هەڵوێستەی ژیانەوە بەڵام بێگومان بەرژەوەندی کوردو ڕقی ڕەوای بەڕێوەبەرانی لە کەمالییەکان لەسەرو گشت ئەوهۆیانەوە دێن.

لەم بوارەشدا ژیانەوە شتی بەکەڵکی زۆری بڵاوکردۆتەوە کە بێگومان، لە سەروو هەموویانەوە هەواڵی دامەزراندنی -جەمعیەی مودافعەعەی وەتەن-ە، لە سلێمانی لەگەڵ دەقی پرۆگرامی ئەو کۆمەڵەیەدا کە بریتییە لە پێنج بەند، بەو بۆنەیەوە ژیانەوە باسی ئەو کۆبوونەوە گەورەیەی بۆ کردوین، لە ڕۆژی چواردەی شوباتی ساڵی ١٩٢٥ لە خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندی سازکراوە و لە ئەنجامیدا پازدەکەس لە ناسراوانی شار بۆ بەڕێوبردنی کۆمەڵەکە هەڵبژێردراون، هەر وەك ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا و ڕەشید مەستی و تۆفیق قەزاز و شەوکەت بەگی عەزمی بەگی بابان و عەلی عیرفان و حاجی سەعید ئاغا-ژمارە-١٦

لە ژمارەی داهاتووی دا لە بری سەرووتار -ژیانەوە- بەیاننامەیەکی تایبەتی ئەو کۆمەڵەیەی بڵاوکردۆتەوە، جگە لە دەقی بروسکەی -جەمعیەتی مودافعەعەی وەتەنی موسڵ- بۆ دانیشتوانی سلێمانی کە سەرجەمی باسی برایەتی کوردو و عەرەب و تارێکی و خراپەکاری تورکە لە ڕۆژگاری عوسمانیەکانەوە، لە ژمارەیەکی تریدا ڕەشید نەجیب و تارێکی بەناونیشانی-ویلایەتی موسڵ-ەوە بڵاوکردۆتەوە و بەتایبەتی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی ئەو هەرێمە کورد و عەرەبن و چۆن بەشێکی زۆری کاتی خۆی سەر بەئیماراتی بابان بووە کە جگە لە موناسەبەتێکی سیاسی جوزئی لەگەڵ حکومەتی تورکدا هیچ دەخلێکی نەبوو -و ئینجا دەڵێت: بێ شوبهەیە کە عەرەبەکانی و یلایەتی موسڵ لە عێراق زیاتر هیچ شتێکی تریان ناوێ، بێنەوە سەر کوردەکانی ئەو ویلایەتە، ئەگەر بۆ بێ ئامال خۆیان حکومەتی کورد تەشکیل نەکرێ و کوردستانی سەرەوە کە ئێستا لە ژێر پێی تورکی زاڵما ئەناڵێنێ نەجات نەدرێ بێ شکو شوبهە ئیتحاد لەگەڵ عێراقدا تەرجیع دەکا لە بوونە خزمەتکاری تورك-ژمارە-١٨.

بەو جۆرە سیاسەتی کورتبینی کەمالیەکان دڵی کوردیان بەجارێك کرمێ کردبوو، ئەوەی لە دەیان ژمارەی -ژیانەوە-دا بەئاسانی و بەقوڵی هەستی پێ دەکرێت، بۆیە

کاتێك لیژنە تایبەتیەکەی کۆمەڵەی نەتەوەییەکان هاتە کوردستان سەرجەمی کورد داوای ئەوەیان کرد ئەگەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد وەبەرچاو نەگرێت ئەوا ئەو کەسە ئەوان بە هیچ جۆرێك نایانەوێت لە عێراق جیاببنەوە، هەموو لایەنەکانی ئەم بڕیارە لەوەدا باشتر خۆ دەنوێنێت ئەگەر بێتوو ئەوە بهێننەوە یاد کە ژمارەیەکی زۆر لە ڕابەرانی هۆزی عوبێد جبور و گەورەو پیاوانی عەرەبی ناو شاری موسڵ داوای ئەوانەی کرد ویلایەتی موسڵ بدرێتە تورکیا.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم دوو ڕاستی بخەمە بەرچاوو، یەکەمیان ئەگەر سیاسەتی شۆڤیانیانەی کەمالییەکان نەبوایە لەوانە بوو چارەنووسی سەرجەمی ناوچەکە بە جۆرێکی تر دیاری بکرێت و تورکیا ببوایەتە زلهێزی ئاوەدان و ئاسودەو نموونەی برایەتی و دیموکراسی. دووەمیان ئەوەیە کەبەداخەوە نەتەوە پەرستانی عەرەب گەلێك زوو ئەو هەڵوێستەی کوردیان فەرامۆش کرا و ئەوانیش کەوتنە لاسایی کردنەوەی کەمالییەکان.

هەر چۆن بێت بڕیاری دانی ولایەتی موسڵ بە عێراق جێگەی ڕەزامەندیی کوردی باشوور بوو- ژیانەوە- بۆ ئەم باسەیش سەرچاوەیەکی بەکەڵکە، سەرجەمی ژمارە پەنجا و چواری، کە شەش لاپەڕە نەك چوار بۆ ئەو ئاهەنگە تەرخانکراوە کە لە سلێمانی بەبۆنەی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە دەربارەی چارەنووسی ویلایەتی موسڵ گێراوەو دەقی وتاری ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگو جەمال بابانو سەعید ئەدیبو ئەحمەد حەمدیو ڕەمزی فەتاحو ژمارەیەك لە شاگردانی قوتابخانەی شاری بڵاوکردۆتەوە دوای دوو ژمارە، کە هەر بۆ خۆیشی دوا ژمارەی ڕۆژنامەکەیە، ژیانەوە باسی ئاهەنگی شاری هەڵەبجەی بۆ هەمان بۆنە کردووە.

کارێکی تری ژیانەوە لەم بوارەدا جێگەی تەقدیری تایبەتییەو هەنگاوێکی بێ وێنەیە لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی لەو ڕۆژگارەدا، ئەویش ئەوەیە کە لە دوازدە ژمارەی یەك لەدوای یەکیدا- ژمارەکانی ٤٢-٥٣ دەقی بەشێکی لەو ڕاپۆرتە گرنگە کردووە بە کوردی بڵاویکردۆتەوە کە ئەو لیژنە تایبەتییەی -کۆمەڵەی نەتەوەکان- بۆ توێژینەوەی کێشەی موسڵ دایناببوو ئەو ڕاپۆرتە یەکێکە لە سەرچاوە هەرە بایەخدارە ڕەسەنەکان بۆلێکدانەوەی گەلێك لایەنی مێژووی نوێو هاوچەرخی کوردو کوردستان کە من بۆ خۆم بێ ئەندازە لە نوسینەکانی خۆمدا کەڵکم لێ وەرگرتووە[٢٥].

-نەوشیروان مستەفا ئەمین

لەژێر ناونیشانی-هەواڵ-دا لە ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستقلال چەند هەواڵێکی لە ڕۆژنامەکەدا کە سەبارەت بەکێشەی ویلایەتی موسڵ دەقاو دەق گواستۆتەوەو تەنیا ڕێنوسی هەواڵەکانی گۆڕیوەو رینووسی ئەمڕۆی بەکارهێناوە، بەڵام لە ڕاوبۆچوونی خۆی دەرنەچووە، ئەمە بەپێچەوانەی ئەو بابەتانەی کەلەسەر ڕۆژنامەی-ژیانەوە-ی نووسیوە لەوێ بەم شێوەیە باس لەڕۆڵی ڕۆژنامەکە دەکات لەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی کێشەی موسڵ دا (هێزەکانی بەریتانیا دوای ڕاگرتنی شەڕلەگەڵ عوسمانی هێشتا موسڵیان داگیر نەکردبوو، بەڵام پێشڕەوییان کرد تا موسڵیشیان گرت، تورك ئەمەی

نەسەلماند کەمستەفا کەمال کاروباری گرتە دەست داوای گەڕانەوەی ویلایەتی موسلی ئەکردو، ئینگلیزیش ئەیویست لەگەڵ ویلایەتەکانی بەغدادو بەصرا لێکی بداو، دەوڵەتی عێراقیان لێ دروست بکا. ئەم کێشەیە بەچارەسەرنەکراوی مایەوەو، بەگفتوگۆی دوقۆڵی تورك و ئینگلیز نەتوانرا بەلادا بخرێ، لەبەر ئەوە خرایە بەردەم کۆمەڵەی گەلان کۆمەڵەی گەلان دەستەیەکی تێکەڵاوی نارد بۆ ئەوەی لەنزیکەوە هەلومەرجی ویلایەتی موسڵ ببینن و بیروڕای دانیشتوان وەربگرن و، ئەوانیش بیروڕای خۆیان لەسەر ئەوەی ویلایەتی موسڵ بدرێتەوە بەتورکیا یان بخرێتە سەر عێراق بدەن بەکۆمەڵەی گەلان بۆئەوەی دوا بڕیاری لێ بدەن)[٢٦] لە درێژەی نووسینەکەیدا دەنووسێت: (ژیانەوە بەوردی دوای هەواڵەکانی کێشەی موسڵ کەوتەوەو سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زانینی زۆر لەڕووداوەکانی ئەو سەردەمە، لەو سەردەمەدا لە موسڵ ڕێکخراوێك دروست کراوە بەناوی- جەمعیەتی مودافەعەی حدود-ەوەبۆئەوەی لای کۆمەڵەی گەلان هەوڵ بدا موسڵ بخرێتە سەر عێراق ئەم هەواڵە لەژ-١٥بڵاو کراوەتەوە[٢٧] لە چەند دێرو ڕستەیەکی تردا کۆمەڵێك هەواڵی سەبارەت بەکێشەکە لە ڕۆژنامەکە گواستۆتەوە.

-فاروق عەلی عومەر

لە بابەت ڕۆژنامەی ژیانەوە-دا دەڵێت: (ڕۆژنامەکە لە بەیداخی دا کۆکی کردنی هەڵکرد بۆ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقەوە چرکە بەچرکە بەدوای کێشەکەدا چوو، داواشی لە کورد کرد گوێ بەوانە نەدەن کەپشتگیری لە خواستەکانی تورکیا دەکەن - ژیانەوە- سەرگەرمانەدا کۆڵیی لە عێراقی بوونی ویلایەتەکە دەکرد)[٢٨].

-عەبدوڵڵا زەنگە

ڕۆژنامەی-ژیانەوە-بەم شێوەیەی دەناسێنێت: (ژیانەوە بەدرێژایی ماوەی دەرچوونی بەشان و باڵی سیاسەتی بەریتانیای هەڵداوە، ئەگەر بەتوانج گرتنیش بووبێ لەنرخ و پایەی جەنابی شێخ مەحمودی کەم کردۆتەوە. لایەنگری حوکمی پاشایەتی عێراقی کردووە. واتە بەهەموو شێوەیەك داکۆکی لەوەدەکرد ویلایەتی مووسڵ بخرێتە سەر عێراق وەك لەهەواڵ و ڕیپۆرتاژەکانی دەیخوێنینەوە)[٢٩].

## بۆ تەنیا ئەم دووڕۆژنامەیە؟!

ئەگەر سەیری مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی بەتایبەتی دوای داگیرکردن ویلایەتەکانی بەسرە، بەغدا، موسڵ لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بکەین تا ئەو ڕۆژەی کەکێشەی سنووری نێوان تورکیا و عیراق لە ساڵی (١٩٢٥) چارەسەرکراوە دەبینین ئەم گۆڤارو ڕۆژنامانە چاپ و بڵاوکراونەتەوە: (پێشکەوتن، ڕۆژی کورد- شەوی عەجەم، بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، بانگی حەق، ئومێدی ئیستقلال، ژیانەوە، دیاری کوردستان) لە زۆربەیاندا باس لە کێشەی ویلایەتی موسڵ کراوە بەڵام

لەسەردەمی دەرچوونی ڕۆژنامەکانی (پێشکەوتن، ڕۆژی کورد، شەوی عەجەم، بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، بانگی حەق) کێشیەك بەرەو یەکلابوونەوەو دواچارەسەر نەدەچوو کە بەکێشانی سنوری نێوان تورکیاو عیراق کۆتایی هات بەڵکو لەکاتی دەچوونی ڕۆژنامەکانی (ئومێد ئیستیقلال) و (ژیانەوە)دا کێشەکە وەك ڕووداوی گەرمی ناوچەکە باس دەکراو ئەو دووڕۆژنامەیەش لەڕووبەری لاپەڕەکانیاندا ڕووبەرێکی فراوانیان بۆ تەرخانکردووەو لەزوربەی ژمارەکانیاندا بەتایبەتی (ژیانەوە) وەك بەشێك لە کێشەی خەڵکی کوردستان بەوردی بەدواچوونی بۆ ڕووداوەکە کردووە، بەڵام گۆڤاری (دیاری کوردستان) کە لەکاتی گفتوگۆی گەرمی وولاتانی زلهێز بۆچارەسەری ویلایەتی موسڵ دەردەچوو گرنگی بەکێشەکە نەداوە، تۆ بڵێیت دەسەڵاتی پاشایەکت ڕێگای بە گۆڤارەکە نەدابێت ئەوجۆرە هەواڵانە بڵاوبکاتەوە، یاخود ساڵح زەکی ساحێبقران خاوەنی گۆڤارەکە بەلای کێشەکەدا نەچووە، یان لەبەر ئەوەی گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی بووە و ئەو کێشەیە لە تایبەتمەندییەکانی گۆڤارەکە دوور بووە؟!

ڕۆژنامەکانی (ئومێدی ئیسقلال) و (ژیانەوە) تۆمارێکی گرنگ و مێژوو نووسین سەبارەت بەبابەتێکی چارەنووسسازی وەك ویلایەتی موسڵ، کە بەهەموو چارەسەرێك هەربەزیان بۆ کورد تەواو دەبوو تەنیا بە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان نەبێت: دیارە ئەگەر بەوردی بەدواداچوونی ڕووداوەکەو وتارەکان لەو دوو ڕۆژنامەیەدا بخوێنینەوە هەست دەکرێت ئەو مەبەستە لەپشتی گرنگیدانی ڕۆژنامە ناوبراوەکان بۆ ئەو کێشەیە هەبووە، (ئومێد ئیستقلال) و (ژیانەوە) زیرەکانە بۆ ئەو ئامانجو مەبەستە کاریان کردووە ئەگەرچی دوو ڕۆژنامەی جیاوازی دوو دەسەڵاتی جیاوازبوون، (ئومێدی ئیستقلال)ی دەسەڵاتی کوردی و (ژیانەوە)ی دەسەڵاتی ئینگلیز کە دەسەڵاتدارێتی کوردی رووخاند بەڵام دەبینین بەرامبەر بەکێشەی موسڵ هێڵی کارکردنیان لەیەکتر نزیکە، لەوەدەچێت ئەو نزیکی‌یە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەو کاتەی حکومەتی کوردی (ئومێدی ئیسقلال)ی دەرکردووە دۆستایەتی لەگەڵ ئینگلیزدا هەبووە.

## هەواڵ لەڕۆژنامەکاندا:

چوار دەوری هەر یەکێکمان بریتی‌یە لە کۆمەڵێك ڕووداو ئەودەوروبەرە کایەئاسا بەردەوام ڕووبەڕووی ڕووداوی تازە دەبێتەوە، هەر لە کۆنەوە مرۆڤ لەهۆکارێك گەڕاوە تائەو ڕووداوانە بەخەڵك بگەیەنێت و ژمارەیەکی زۆرکەس لەمەبەستی ڕوودانیان بگات، ڕۆژنامە بەهەمووجۆرو شێوەکانی پێشکەوتنییەوە لێپرسراوێتی گەیاندنی ڕووداوەکانی ڕۆژی لەئەستۆ گرتووە، ئەوژانەرەی کە ڕووداوێك دەگوازێتەوە پێی دەوترێت هەواڵ هەواڵیش لەسەر چەند پرەنسیپێك دادەڕێژێت و وەك هەر هونەرێکی تر هونەری هەواڵیش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

لەم چەند دێرەی دادێ هەوڵ دەدەین وەڵامی ئەم پرسیارانا بدەینەوە، ئایا ئەو ڕۆژنامانە بۆ گرنگیان بە لاوان بە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی کێشەی ویلایەتی موسڵ داوە؟ چۆن مامەڵەیان لەگەڵ ڕووداوەکە کردووە؟ وەك هەواڵ ویستویانە چی بەخوێنەران بڵێن؟

وەك دەزانرێت لە نیوان ساڵی (١٩٢٠-١٩٢٦) یەکلا کردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ دیارکردنی سنوری نێوان تورکیا و عیراق و ململانێکانی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەریتانیای گەورە لەسەر دابەشکردنی ناوچەکە ڕووداوی گەرمی ناوچەکە بوون کە لەو گفتوگۆیانەدا کە پاشان وەکو لەبەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێداوەو چەندان ڕێکەوتن نامەو وەپەیمانی لێکەوتۆتەوە چارەنووسی کوردستانیش بەتایبەتی ئەو بەشەی کە ئەمڕۆ وەك کوردستانی باشوور ناسراوە باسکراوەو لە زۆربەی کۆبوونەوەکانیش دا بەگرنگی پێدانەوە ئاماژەی پێدراوە، هەربۆیە ڕۆژنامەکوردییەکانی ئەوسا وەك ڕوداوێکی گەرمی وابەستە بە خەڵکی کوردستان لەزۆربەی ژمارەکانیاندا وەك هەواڵ گرنگیان پێداوەو بەردەوام بە دواداچونیان بۆ کردووە.

هەست دەکرێت لەکاتی گواستنەوەی هەواڵەکاندا سەرچاوەی وەرگرتنی هەواڵەکان ئاماژەیان پێدراوەو بەوە دەردەکەوێت ڕۆژنامە نووسانی ئەو ڕۆژنامانە زانیاریان سەبارەت بەڕۆژنامە بەگشتی و هونەرەکانی هەواڵ هەبووە، بۆ نمونە ئەگەر سەیری ئەم هەواڵەی خوارەوە بکەین کە لە ژمارە (٦)ی ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال)دا بڵاوکراوەتەوە وردبینی ئەو ڕۆژنامە نووسە دیاردەخات کە هەواڵەکەی دارشتۆتەوە (نەزەر بە تەلەغرافێك کە جەریدەی ئەلبەلاغ بە سورەتی خسوسییەوە لە ئەستانبوڵ وەریگرتووە تۆفیق بەگ میرئالای بووە بەرەئیسی جەمعیەتی ئەو تورکانەی کە مەئمورن بۆ موزاکەرەی موسڵ، لەپاش حازربوونی هەیئەی ئینگلیز لە (٢٥)ی تشرینی ئەوەڵدا موزاکەرە دەست پێ دەکا).

بابەتەکەمان تایبەتە بەکێشەی موسڵ بۆیە تەنیا ئاماژە بەو هەوالانە دەکەین لەو ڕووداوە دەدوێن، لەم هەواڵەی ڕۆژنامەی (ژیانەوە)دا بە دروخستنەوەی هەواڵیش تەئکیدی لێکراوەتەوە، لەم ڕووەوە ڕۆژنامە کوردییەکان هەوڵیان داوە وردو درشتی

ڕووداوەکە بە خەڵکی کوردستان بگەیەنن: (ئەستەمبوڵ: شەرکەتی تەلەغرافی ئەناتۆڵ تەکزیبی ئەو خەبەرەی کرد کەغەزەتەی ئەڵماتان لە (١٥)ی ئەیلولدا بڵاوی کردبوەوە کە حکومەتی تورکیا ڕەدو بەدەلی لەگەڵ مەندوبی ئەڵمان و ڕوس کردووە لە بابەت ئیقتدارو ئستعدادی عەسکەریەیەوە دائیر بەمەسئەلەی موسل).

دەکرێ لە ڕوویەکی ترەوە بۆ هەواڵ بچین واتە بەچەند دێرو وشە دەتوانرێت ڕووداوەکە بگەیەنرێت، بۆ نمونە ئەم دوو هەواڵەی پێشەوە لەکورتە هەواڵەکانی ڕۆژنامەن، ڕۆژنامەکانی (ژیانەوە) و (ئومێدی ئیستقلال) هەر سەبارەت بەکێشەی موسڵ هەواڵی کورتتریشیان بڵاوکردۆتەوە بۆنمونە (لۆندرە-غەزەتە ئەنووسێ ئیحتمالە مەسەلەی موزاکەرەی موسڵ لە ئەستامبوڵ حەل بکرێ) ئەم کورتە هەواڵە لە ڕۆژنامەی (ئومێد ئیستقلال) ژمارە (١٧) بڵاو بۆتەوە، هەروەها ڕۆژنامەی ( ژیانەوە)ش لە کورتە هەواڵ چەند دێری بەدەرنیە، لە ژمارە (٣٩)دا ئەم کورتە هەواڵەی تێدایە: (وەزارەتی خارجیەی تورکیا تەبعی کیتابی ئەلئەحمەر کە موتەعەلیقە بەمەسئەلەی موسڵەوە تەواوکرد. وە نوسخەیەکی تەقدیمی سەفیری بەریتانیا لە ئەنقەرە کرد).

ڕۆژنامەکان (ئومێدی ئیستقلال) و (ژیانەوە) هەواڵی درێژیشیان تیایەو هەوڵیان داوە بەهۆی زیاتر لەدەدێر ڕووداوێک دا لەڕووداوەکانی کێشەی ویلایەتی موسڵ بەخوێنەران بگەیەنن وەك نموونە بۆ هەواڵی درێژ لە ژمارە (٥٠)ی (ژیانەوە)دا ئەم هەواڵە دەگوێزینەوە: (لۆندەر-٨ت٢-وەزیری موستەعمەرات میستەرئیمیری دوێ شەو لە پۆرتسموت وتویەتی ئومێدم هەیە جەمعیەتی ئەقوام لە مانگی پێشەوەماندا دائیر بە موسڵ قەرارەکەی بدا. وە وتویەتی عەلاوەی ئەهمیەتی مەخسوسەی مەسئەلە بۆ هەمووعالەم لەئیجاباتی موسالەمەت کە جەمعیەتی ئەقوام قەرار بداو تەئیدبکات. ئارەزووی گەورەی حکومەتی بەریتانیا ئەمەیەکە مەسئەلە بەموسالەمەت حەل بکرێ. لەعەینی وەختا بەکەمالی عەزەمەوە ئیسراری کرد لەسەر حقوقی خۆی وەحقوقی ئەو میلەتەی کە ئیعتیمادیان پێ کردبوو کابینەی متەوالیەی بەریتانیا تەعەهودیان بەمیلەتی عێراق دابوو کەمەیدانی نەدەن جارێکی تر بخرێتە ژێر ئیدارەی تورك، وە وەعدی بەعێراق دابوو کەحکومەتێکی حورو موستەقلیان بۆ تەیید بکا. حەسب ئەلئیمکانی مەعاونەت کرا، وە لە وەعدەیان وەفای نواند. فەقەت ئەمڕۆ حکومەتی تورکیا داوای لێ جوێ کردنەوەی دەوڵەمەندترین پارچەیەکی عێراق ئەکا، کە ئەم داوایەیش نەلەسەر دەلیلێکی قەومیەتە لەسەر ویستنی میلەتە. بەدەفعی وردی ئەم داوایە حکومەتی بەریتانیا لەو قەناعەتەدایە کەمحافەزەی حقوقی خۆی کردوە. وەحکومەتی بەریتانیا لەمودافەعەی ئەم مەسئەلەیەدا تەنها بەواسیتەی تەحکیم دەست هەڵناگرێ. زەروورەتی حەس بکرێ موراجەعەتی بەقوەتیش ئەکا).

## ووتار لەرۆژنامەکاندا:

گەلێك جار خوێنەران لەسەردێرو هەواڵو ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی وەڵامی ئەو پرسیارانەیان دەست ناکەوێت کە دەیانەوێت بیانزانێت، بۆ ئەو حاڵەتە یەکێك لەو هونەرانەی کە ڕۆژنامەنووس هانای بۆ دەبات هونەری وتار و وتار نووسینە، ڕۆژنامەنووس لە وتاردا بابەتێك (ڕووداوێك) شیتەڵ دەکاتو لەچەند ڕوویەکەوە خاڵ لەسەر ئەو ووشەو ڕستانە دادەنێت کە پێویستن، لە وتاردا بە سوود وەرگرتن لەزانیاری‌و هەندێ جاریش پشت بەستن بەزانیاری پشتی پەردە وتارەکەی بەهێز دەکاتو سەرنجی خوێنەران بەلای نوسینەکەدا ڕادەکێشێت.

وتار بریتییە لەچەندان جۆری جیا واز، کەلەهەیکەلی نووسیندا زۆر نزیکن لەیەکەوە بەڵام لەباری زاراوەو تایبەتمەندی ناوەڕۆکەوە جیاوازن، بۆ نمونە وتاری زانستی‌و سیاسی دەشێ لە هەیکەلی دارشتن دا وەك هونەرێکی ڕۆژنامەنووسی هەڵگری یەك پرانسیبی دارشتن بن بەڵام بۆ ئەو کەرەستانەی کە لە کاتی نووسینی وتارێکی زانستی‌و وتارێکی سیاسی‌دا جیاوازن تا لەو وەڵامانەی کە بە خوێنەران دەدرێت لەیەك ناچن چونکە پێش هەمووشتێك ئەو دووجۆرە ووتارە دوو خوێنەری جیا واز و دوو زاکیرەی جیاوازن، بۆ وەرگرتنی زانیارییەکەو گەیاندنی مەبەست، ئێمەلێرەدا لەو جیاوازیانە نادوێین چونکە لەچوار چێوەی بابەتە سەرەکییەکە دەچینە دەرەوە، ئەوەی مەبەستی ئێمەیە ئاماژە کردنە بەچەند وتارێکی ڕۆژنامە ناوبراوەکان سەبارەت بەکێشەی ویلایەتی موسڵ.

لەدوو توێی ئەو وتارانەدا دوو شێوە وتار دەبینرێن:

١-نووسین

٢-وەرگێڕان

لەو وتارانەدا کە نووسەرانی ڕۆژنامەکان نووسیویانە یاخود لە دەرەوەی ستافی ڕۆژنامەکان بەمەبەستی بڵاو کردنەوە گەیشتۆتە ڕۆژمەناکە هەست دەکرێت هەندێکیان وتاری ئاسایین‌و ڕەچاوی هونەرەکانی وتار نووسین نەکراوە بەڵام لە هەندێك وتاردا هەوڵ دراوە ڕەچاوی هونەرەکانی دارشتنی وتار بکرێتو لە کاتی نووسینەوەی ڕووداوێکدا شتێکی زیادە لەهەواڵی ئاسایی بەخوێنەران بدرێت لەو ڕووەوە دەتوانرێت ئاماژە بەچەند وتارێك بکرێتو چەند پەرەگرافێکیش بگوازینەوە بۆ زیاتر ووردبوونەوە لە حەقیقەتی وتارەکان باشترە سەیری دەقی ڕۆژنامەکان لەبەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا بکرێت، دیارە بۆ زووربەی قسەوباسەکان وەك نموونە پێویستە خوێنەران بۆ بەشی سێیەم بگەڕێنەوە.

–عەبدولحەمید لە وتارێکدا بەناونیشانی (کوردو تورك قەتعیەن پێکەوە ناژین) دەنووسێت، (فائیق سەبری کەخۆی تورکەو مەئزونە لە دار ئەلفنونی سۆربۆن و یەکێکە لەموتەخەسیسی عیلمی ئەقوام و جوگرافیا لە کتێبێکدا لەبەحسی ویلایەتی موسلّ دا وەها بەحس ئەکات: سەکەنەی ویلایەتی موسلّ بەئەکسەریەتی عمومی میلەتی کوردە ئەم میلەتە جەسورە دائیمەن مەقابیل بەحکومەت لە شەڕو موحارەبەدان) لە درێژەی وتارەکەیدا دەڵێت، (لەم بەحس و بەیاناتەدا وەها دەرکەوتووە کە میللەتی نەجیبەی کوردلە زەمانی ستوتیانا دیسان حکومەتی تورکیان نەوویستووە) لە کۆتایدا نووسیویەتی، (وەکو تورکەکان ئیعترافیان بەم ئەحواڵە کردووە ئەڵبەتی عالەمی جیهانش قەتیعیەتی بۆ حاسیل بووە کە کوردو توورك قەتیعەن پێکەوە ناژین و یەك ناگیر نابن) ئەم ووتارە لە ژمارە (١٧)ی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) بلاّوبۆتەوە لە ژمارە (١٨)ەشدا (ڕەشیدنەجیب) دوو ناونیشانی (وویلایەتی موسلّ) وتارێکی نوسیوە لە وتارەکەیدا دەڵێت: (وویلایەتی موسلّ دەورەی تەنزیماتی حکومەتی عوسمانی کە لە (١٢٨٠) دەستی پێکردووە لەگەڵ وویلایەتی بەسرادا هەر لەتەرەفی وەزیرێکی فەوق ئەلعادەی تورکەوە کە لە بەغداد دائەنیشت ئیدارە ئەکراو قسمی کوردستانی کە لە وویلایەتی موسڵدا بوو بە سوورەتێکی مومتاز تەودیع بەسلالەی بابان کرابوو لە تەرەفی ئەوانەوە ئیدارە دەکرا).

لە کاتی چاوگێڕان بەو ڕۆژنامانەدا کۆمەڵێك وتاری وەرگێردراوو ئامادە کراومان دێتە بەرچاو کە باس لە کێشەی ویلایەتی موسلّ دەکەن، دەبینین لە پێناوی ئەمانەی ڕۆژنامەنووس ئەو وتارانە چەند بیروڕایەکیان تێدایە کە دژی چارەنووسی خەڵکی کوردوستانن کەچی دەقاودەق وەرگێڕ دراون و بلاّوکراونەتەوە لەو ڕووەوە دەتوانین ناونیشانی ئەو ووتارانە بنوسینەوەو چەند ڕستەیەکیش بگوازینەوە، ناونیشانی وتارەکان: (موسلّ کلیلی شەرقی ئەوستە، مشکیلەی موسلّ لەبەینی تورك و ئینگلیزدا) لە وتاری یەکەمداهاتووە: (ویلایەتی موسلّ چونکە واقع بووە لەسەر نەهری دیجلەو سیلسیلەی جیبالی کوردستان، بەڕەن و نەهرەن بەبەغداد، هیتد، ئیرانی کورد تا ئەنادۆڵ و بەسوریە مەربۆتەوبە واسیتەیەوە بۆتە کلیای شەرقی ئەوسەت) لە وتاری دووەمیشدا ئەم پەرەگرافە دەگوازینەوە: (موخبیری غەزەتەی ئەلموقەتەم لەئەستامبۆڵەوە ئەخباری کردووە کە ئەنزار متەوەجیهە بەحەلکردنی مەسئەلەی موسلّ کەحەل و فەسلی ئەم مەسئەلەیە موتەعەلیق بووە بەخیتامی سوکی ئینگلیزو تورك دکتۆر عەدنان بەگ بۆئەم خسوسە موراجەعەتی بەسەفارەتی ئینگلیز کردووە لەبەر ئەمە لەنسفی ئەوەلی مانگی ئۆکتۆبەردا هەیئەتێك دائەمەزرێ بۆ ئەم هەیئەتە هێشتا جێگای موزاکەرە تەعین نەکراوە چونکە ئەبێ جێگایەکی وا ئینتخاب بکرێ کە بۆ موخابەرات و تەعلیمات وەقت و زەمان زایع نەکرێ، ئەمەیش ڕەنگە ئەستانبۆڵ بێ).

## زمانی هەواڵ و وتارەکان:

سەرپەرشتیارو ڕۆژنامەنووسانی (ئومێدی ئیستقلال) و (ژیانەوە) دەرکیان بەزمانی تایبەتی ڕۆژنامە نووسی کردوە وە لە پێناوی گەیاندنی ڕووداوەکانی کێشەی موسڵ دا بەخوێنەرانی بەزمانێکی سادەو ئاسان هەواڵ وەوتارەکانیان دارشتوەو، ئەگەر بوونی وشەیەکی زۆری عەرەبی لە ڕستەی هەواڵ وەنووسینەکانیاندا بخەینە لاوە، چونکە ئەوسا هێشتا زمانی نووسینی کوردی لەووشەی بێگانە بژار نەکرابوو ئەوە دەتوانین بڵێین زمانی داڕشتنی هەواڵ وەنووسینی وتارەکانی ئەو دوو ڕۆژنامەیە تایبەت مەندن بۆ قۆناغێکی زمانی هەواڵ وە وتاری ڕۆژنامەنووسی کورد لەمێژوی ڕۆژنامە گەریماندا، تالە هەڵبژاردنی ناونیشانەکانیشدا شارەزایی بەدی دەکرێت، وەك نمونە دەتوانرێت سەیری ئەم هەواڵە بکرێت لەژێر ناونیشانی (موسڵ لەئەنقەرەدا)یەو ڕۆژنامەی تر وەرگێڕاوە: (ئەستەمبوڵ-لەمەجلیسی وەتەنی ئەنقەرادا دەرحەق بەئەحواڵی خارجیە مناقەشەیەکی بەشدەت کراوە وەلەو ئیجتماعەدا کەلەهەفتەی پێشوودا عەقد کرابوو قسمێکی زۆر لە مەبعوسانی تورك بۆ ئیجرای ئەم موناقەشەیە لەسەر ئەو کردەوانەی حکومەتی بەریتانی لەویلایەتی موسڵ ئیلحاح و ئیسراریان کرد لەحکومەت ببێ موسامەحەتە لەویلایەتی موسڵ بکەن، هەتا شاخان حەمرینیش کەقەشەیە ئیستیلای بەسەردا بکرێ) ئەو هەواڵە لە ژمارە (٢١)ی (ئومێدی ئیستقلال)وە بڵاوبۆتەوە.

لە پێناو باشتر ناسینی زمانی ڕۆژنامەنووس ڕۆژنامەی (ژیانەوە) تەنیا وەك نموونە ئەم هەواڵە لە ژمارە (٤٢) دەگوازرێنەوە! (لەندەن: تەلەغرافی لەجنێڤەوە هاتووە ئەڵێ شایعە لەبەینی خەڵقدا دەوران ئەکا کەئەو هەیئەتە (٣) کەسی عەسبەتی ئەلئومەم وەمەسەلەی موسڵ تەشکیلی پێکردبوو تەهیدی تورك ئەکا ئەگەر ڕاستی ئەم شکاتی مەندوبەی بەریتانیا تەحقیق کە لە مەسیحیەکان لەوەتەنی خۆیان تەدبعید کراون چونکە ئەمە بۆ نەتیجەی حوکمی مەسئەلەی موسڵ تەئسیری خراپی هەیە والازمە لەسەر تورکەکان لەم کردانەوە کەمغایری مەدەنیەت دەست هەڵگرن).

من لەو باوەڕەدام ڕۆژنامە نووسانی ئەو دوو ڕۆژنامەیە دەیان توانی ڕۆژنامەکانیان لە هەندێك لەو ووشەیە بەکارهاتووە بێگانانەبپارێزن وەووشەی کوردی باوی ئەوسا بەکاربهێنین بەلام لەپێناو زۆرتر گەیاندنی مەبەستی ڕۆژنامەکانیان بووە. بە تایبەتیش لەهەوڵو ووتارەکانیاندا زمانی ئەودوو ڕوژنامە نزیك بوو لەزمانی بەکار هاتووی زۆرینەی خەڵك، هەروەها ویوستوویانە ڕۆژنامەکانیان لە زمانی ئەدەبی جیاواز بێت ئەگەر نا وەك دەزانرێت ئەوسا کۆمەڵێك دەقی ئەدەبی کوردیمان هەیە کەزمانێکی تا ئاستێك پاراوە وەنووسراون، بەلام ئەو ڕوژنامەنووسانە دیارە زانیاریان سەبارەت بەزمانی ئەدەب و زمانی ڕۆژنامە هەبووە.

## ڕاپۆرتە هەواڵ و ڕیپۆرتاژ:

ڕاپۆرتە هەواڵ ژانرێکی تری زیندووی ڕۆژنامەی هەواڵەو بەشێکە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی هاوچەرخ، ڕوانینەکانی خود خالێکی دیاری نێوان هەواڵو ڕاپۆرتە هەواڵ تەنیا پشت بەگەورەیی ڕووداو نابەستێت بەڵکو بارودۆخ و هۆکارو کاریگەریەکانیش فەرامۆش ناکاتو ئەگەر لەڕووی هونەرکاریەوە بەراورد لەنێوان هەواڵو ڕاپۆرتە هەواڵدا بکرێت، لە ڕاپۆرتە هەواڵدا جۆرەها هونەری ڕۆژنامەنووسی بەکاردەهێنرێت وەك وەسف، گێرانەوە، گفتوگۆ، بەدواداچوونی خود) [30] ئەو هۆکار و هونەرکاریانە وایان لە ڕاپۆرتە هەواڵکردوە کە لە هەواڵ کاریگەری زیاتری لەلایەن خوێنەران دروست بکاتو جێ بێڵێت لەو بابەتانەی کە لە هەر دوو ڕۆژنامەی (ئومێد ئیستقلال) و (ژیانەوە) سەبارەت بەکێشەی ویلایەتی موسڵ بلاو بونەتەوە، چەند ڕوداوێك ودك ڕاپۆرتە هەواڵ وەرگیراون و بلاو بوونەتەوە کەدەتوانرێت دەستنیشانی چەند ناونیشانێك بکرێت.

(موشکلەی موسڵ لە بەینی تورك و ئینگلیزدا، ئومێدی ئیستقلال، ژ-١١-)، (مەسئەلەی تورکیا و موسڵ، ئومێدی ئیستقلال، ژ-٢٣)، (موزەکەرەی موسڵ چەوەقت دەست پێ دەکا، ئومێدی ئیستقلال، ژ-٢٤-)، (لە غەزەتەکانی عەرەبیەوە، ژیانەوە، ژ-١٥-)، (مەسەلەی حدودی شیمالی، ژ-٣٥-)، (پەیمانی مستەر ئیمری لە بابەت موسڵەوە، ژیانەوە، ژ-٤٠-)، (لە مەحکەمەی عەدلی دەولی لاهیدا مەسئەلەی موسڵ و حازر نەبوونی موومەسیلی تورکیا، ژیانەوە، ژ-٤٨-)، (تەسریحاتی میهمەی وەزیری موستەعمەرات دائیر بە موسڵ، ژیانەوە، ژ-٥٠-)

ڕیپۆرتاژ ڕاست لە تەوەری ڕوداوێکی دیاری کراو دەسوڕێتەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەو بابەتەی کە لە سەری دەنووسرێت بەزمانێکی سەرنج ڕاکێشەوە ئامادە کرابێت و نووسرابێت. دیاری کردنی شوێنی ڕوداوەکەو کاتی ڕوداودکە خالی گرنگن بۆ ڕیپۆرتاژ تابتوانێ بنیاتی پرسیاری (بۆ؟)ی لەسەر بنیات بنێت لە هەردوو ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال) و (ژیانەوە) لەو بابەتانەی کە ئێمە مەبەستمانە واتە کێشەی ویلایەتی موسڵ کە بلاوکراونەتەوە وەك ڕیپۆرتاژ هیچ بابەتێك کەپێوەندی بە هەیکەلی هونەری ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی یەوە هەبێت نایەتە بەر چاو، بەڵام دەکرێت تەواوی ژمارە (٥٤) وەربگرین کە بریتیە لە کۆکردنەوەی بابەتەکانی ئەو ئاهەنگەی کە بەبۆنەی دەرچوونی بڕیاری نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ چارەسەر کردنی کێشەی موسڵ دەرچووە، ڕیپۆرتاژێکی تەقلیدیە هونەر کاری نوێی تێدانیە تەنیا بیری ڕیپۆرتاژی لە خۆگرتووە کە بریتیە لە دەقی ئەو ئاهەنگە بەبۆنەی ناوبراو،لە ژمارە (٥٦)ی هەمان ڕۆژنامەدا، واتە لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە) هەوڵێکی تری ڕیپۆرتاژی دراوە بە ناوی (حەفلەیەکی تەبریکیە لە مژدەی قەراری عوسبەتی ئومەم لە خسوسی موحافەزە کردنی حدودی ویلایەتی موسڵ و حقوقی کورد) ئەم نووسینە گێرانەوەی کورتەی ئەو ئاهەنگەیە کە بەبۆنەی بڕیاری ناوبراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەڵەبجە بەڕێوە چوو،هەر دوو بابەتەکە کە لە ڕاپۆرتە هەواڵیش نزیکن.

## سەرچاوەی هەواڵەکان

(هەمیشە دەبێت بەتەواوی سەرچاوەکانی هەواڵ یان هەر زانیاریەکی پەخشی تەلەفزیۆنە بە خوێنەران بڵێین. تەنها لە کاتێکدا هاولاتیان دەتوانن بڕیار لە سەر ڕاستی یان باری یاسای زانیاریەکان بدەن کە سەرچاوەی هەواڵێکەیان زانیبێت)[٣١] واتە بۆئەوەی ڕۆژنامە ڕاستگۆی خۆی لە دەست نەدات پێویستە ناوی ئەو سەرچاوەیە ببات کە هەواڵەکەی لێ وەرگرتووە، ئەو کەس و کەناڵەی کە ڕوداوەکەی بۆ ناردووە پێویستە بناسرێت یاخوود ناسراو بێت، ڕۆژنامەکانی (ئومێدی ئیستقلال) و (ژیانەوە)ش ناوی ئەو سەرچاوانەیان فەرامۆش نەکردووە کە هەواڵەکانی کێشەی ویلایەتی موسڵ-یان لێ وەرگرتوون، ئەو دوو ڕۆژنامەیە هەواڵەکانیان لەم سەرچاوانە وەرگرتووە: (ڕۆژنامەی ئەل ئەمەل، ڕۆژنامەی نەجمە، ڕۆژنامەی ئەلعراق، ئاژانسی ڕۆیتەر، ڕۆژنامەی ئەلعەهد، ڕۆژنامەی ئەلموفید) ئەمە و بێجگە لە سەرچاوەی تایبەتی هەر دوو ڕۆژنامەکە.

ناوهێنانی ئەو سەرچاوانە لەگەڵ هەواڵە بلاوکراوەکاندا جارێکی تر دەیسەلمێنێ کە نوسەران و ڕۆژنامەنووسانی هەر دوو ڕۆژنامەکە لە هونەرەکانی ڕۆژنامەنووسی بەتایبەتیش لە موسداقیەتی ڕۆژنامەیان زانیوە و زانیاریان لەو بوارەشدا هەبووە.

لـەم بەشـەدا دەقـی ئـەو ڕاپۆرتـەی دەسـتەی دەسـت نیشانکردنی سنوور کە پێشکەش بەنەتەوەیەکگرتووەکان کراوە نوسیوەتەوە کە لە ژمارەکانی (٤٢) (٤٣) (٤٤) (٤٥) (٤٦) (٤٧) (٤٨) (٤٩) (٥٠) (٥١) (٥٢) (٥٣)ی ڕۆژنامـــەی (ژیانــەوە) بڵاوبۆتــەوە، هــەر لــەم بەشــەدا لــە هــەر دوو ڕۆژنامـەی (ئومێدی ئیستقلال) و (ژیانـەوە) ئـەو هـەواڵو وتارانەشمان نووسیوەتەوە کە باس لە کێشـەی ویلایـەتی موسڵ دەکـەن، لـەکاتی نووسـینەوەی ڕاپـۆرتو هـەواڵو وتارەکان تەنیا ڕێنووسمان گۆڕیوەو خستوومانەتە سـەر ڕێنووسی بەکارهاتووی ئەمڕۆ لە کوردستانی باشووردا.

جەمعیەتی ئەقوام
مەسئەلەی حدودی بەینی تورکیا وعێراق
بەمەوجبی قەراری-٣٠ ئەیلولی ١٩٢٤
سورەتی موتەرجمەی راپۆری هەیئەتی حدود کەتەقدیم جەمعیەتی ئەقوام کراوە
قسمی ئەوەل: بەیانی وەزائیفی هەیئەت
مەجلسی ئەقوام: بۆ روئیەتی مەسئەلەی حدودی عێراق

لە جەلسەی (٣٠ ئەیلولی ١٩٢٤)دا مەوافیقی دووەمین فەقەرەی بەندی سیەمی مەعاهەدەی لۆزان بۆ جەمع و گردکردنەوەی دەلائیلی موسبەتەو ئەعزا تەشکیلی هەیئەتێکی قەراردا.

ئەو هەیئەتە بەموجەب ئەو قەرارەکە ئیتخاز کراوە:

١-بۆ معاونەتو یاریدەی حوکم، هەموو نەوعە مەعلوماتو ئیزاحات بەمەجلس تەقدیم کردن.

٢-چ لەئەساسی مەسئەلەوە چ دائیر بەئیجرای وەزیفەی وەسائیقو بەیاناتێ کەلەتەرەفەینەوە سەردو ئیراز ئەکرێ بەنەزەر ئەهمیەت تەماشاکردن.

٣-بەموخابەراتی تەرەفەین کە لەگەڵیا ئەکرێ ئەجابەت کردن.

٤-لەعێراقدا دەست بەتەفتیش،وەلەومعاونانە کەلەتەرەفینەوە تەعیین ئەکرێ معاونەت تەلەب کردن.

٥-خەتی حەرەکەتیان بیلزات خۆی تەنزیمی بکا.

مەجلسی ئەقوام بەئیتیفاقی ئارای ئەعزای هەیئەتەکەی تەعیینو بەحوکمی مەسئەلەکەیشی تەودیع بەرەئیس کردبوو.

رەئیسی هەیئەت و مەحکەمەی مەسئەلەی تەودیع بەقونت تلەکی سابیقی رەئیسی نەزاری مەجارستان، موسیوئوف و یرسن ئی سوە چی و کۆلۆنیلی پۆلیس بلچیقاپی. کرد ئەمانەش ئیجابەت و لە ١٣ تشرینی ساڵی ١٩٢٤ دا لەجنورە ئیجتماع و تەشکلی هەیئەتیان کرد.

لە ئیعتباری ئەم تاریخەوە خولاسەی وەزائیفی هەیئەت وەکو لە ژێرەوەیە:

هەیئەت دەست بەجێ لەو وەسائیقە کەسکرتێری عوسبەتی ئەلئومەم دائیر بەحدوی عێراقو توورکیا ئیحرازی کردبوو کەس بێ ئتلاعیان کرد، لەپاش خوێندنەوەی مەحزەری جەلسەکانی جەمعیەتی ئەقوام، مەجلسی لۆزان وە بەیاناتی حکومەتی بریتانیا و تورکیا پلانی وەزیفەکەی تەرەسوم کرد. بۆ تەفتیش و تەحقیق وە بۆ ئیستحسالی وەسائیقی لازمە بۆ مەحەلی مونازەعە چونیان قەراردا، لوزومیەتی حەس کرا کە راستە و راست لەم دوو حکومەتە عەلاقەدارە لەخسوسی بەعزێ مەسائیلەوە وەسائق و مەعلومات ئیستحساڵ بکرێ بینائەن عەلەیهی شەخسەن لەگەڵ (...)[٣٢] ئەم دوو حکومەتە تەماس بگرێ بۆ لۆندەر و ئەنقەرە چونیان قەراردا.

لەپێش دەست بەتەفتیش کردنی مەواقیعی لازمەو بۆ ئەمەی بەبێ وەقت فەوتاندن ئەو مەعلوماتەی کە وەرگرتبێ پێویستە نائیل بێ بەعزێ سوئالاتی بۆ ئەم دوو حکومەتەی نارد.

هەیئەت لەپێش حەرەکەتیان لەجنورە موسیو ئۆف ویرسن بەرەئس ئینتخاب و قەرار سارد بوو.

وەختێ کەهەیئەت گەیشتە لۆندرە لەتەرەفی نازری خارجیەو نازری موستەعمەراتەوە ئیستقبال و لەمواجەهەی ئەهلی خیبرەی ئەم دوو نەزارەتە چەند مولاقات وئیجتماعێ عەقد کرا. میستەر داویدسن کە یەکێکە لە ریجالی نزارەتی موستەعمەرات لەپاش بەیانی خۆش ئامەدی هەیئەت وە لە تەعین کردنی ئەم هەیئەتە بەیانی مەمنونیەتی حکوومەتەکەی کرد. وە ئەم تەدبیرەیش لای حکومەتی بریتانیا لە ئیستفتا مونانسیبترو بۆ حەلی مەسئەلە بەچاکتر عەدل کردنی ئیزهار کرد.

لەپاش بەیانی رای میستەر داویدسن هەیئەت لە تەرەفی مەجلیسەوە مالك بوونی بەحوریەتی واسیعەوە بۆ ئەم ئیشە یا ئیستفتال وە یان رێیەکی ترکە بەفائیدە بێ لەکردنیا سەربەست بوونیان بەیان کرد میستەر داویدسن بۆ هەیئەتەکە تەشەکوری نواندو بەیانی کرد کە نیازی هەیە فکرو تەشریحاتی حکومەتی بریتانیا لە خسووسی ئستفتاوە بە هەیئەت تەقدیم بکرێ ئایا لەم مولاقاتە وەیا لە ئیجتماعەکانی تری ئوخرا ئەو واجبانەی کەهەیئەت بە بریتانیای دابوو تەدقیق کرا.

لەدوایدا هەیئەت بە موجەب ئەو قەرارەی کە لە پێش حەرەکەتدا لە جنورەدا بووی بۆمعاونەت... لە ئەسنای وەزیفەدا تەکلیفی حکومەتی بریتانیای کرد کە معاونەکانی تەعین بکا.

هەیئەت لە ئەواخیری عەین ساڵدا بۆ ئەستەمبوڵ و لە (٢) کانونی سانیدا لە ئەستەمبۆڵەوە بۆ ئەنقەرە حەرەکەتی کرد.

موبادەلەی ئەفکار لە بەینی مومەسلینی جمهوریەتی تورکیاو هەیئەتی موشابەهە بەئەحواڵی لۆندرە جەرەیانی کرد. لێرەیش هەیئەتی مالك بونی بە سەلاحیەتی نامە، وە بۆحەلی مەسئەلە لە خەتی حەرەکەتیا حور و سەربەست بوونی تەسریح کرد، شایان دیقەتە کە نازری خارجیەی تورکیا جەوابی ئەو سوئالانەی کە لە جنورەوە لێی کرابوو وە بۆ تەئیدی نەزرەیەکی ئەو دەلائیلەی کە بەیانی کرد بوو لێرەدا دیسان خولاسەی بەیانیو فکری ئاتی عەلاوە کردبوو.

ئیرادەو تەسریحاتی ئەهالی بۆ حەلی مەسئەلەی لازمە بە عاملی ئەسلی عەد بکرێ. ئەم ئارەزووە رەغبەتەی کە هەم حکومەتو هەم میلەتی تورك ئیزهاری کردووە ئومێد ئەکەین هەیئەت بەنەزەری ئیعتبار تەماشای بکا وە بۆ حەلی مەسئەلە لەئەهالی ویلایەتی موسڵ لازمە بەکەمالی حوریەت بەیانی رای لێ بکرێ. ئەمە لە تەشکیلی جەمعیەتی ئەقوامەوە تا ئێستا ئەوەڵ دەفعەیە کە وەها لەبەینی حکومەتێکی گەورەی غەربو دەوڵەتێکی شەرق مونازەعەیەکی میهمی پێداو تەودیع بەم مەجلیسە کراوە. ئیعتمادو ئیخلاس وە عەلاقە بێ کە لە ئیستیقبالدا لە بەینی غەربو شەرقدا تەئسیسی موحتەمەلەو ئەمەیش غایەی جەمعیەتی ئەقوامە. بۆ ئیعتقادی شەرقیەکان لە هەموو شتێ زیاتر متەوەقیفە بە تەدقیقاتی هەیئەت وە لە پاشا مەربۆتە بەو سورەتی حەلەکە ئیحزار ئەکرێ.

جمهوریەتی تورکیا قەناعەتی پەیدا کردووە، کەهەیئەت ئارەزووی هەیە لە بەینی شەرقو غەربدا ئیعتمادێکی موتەقابیل بهێنێتە وجود.

له پاش موزاكەرەیەكی دووروودرێژ هەیئەت ئەفكاری خۆی بە حكومەتی توركیا سەلمان. وەلە حكومەتی ئەنقەرەیش بۆ ئەمەی لەئەسنای وەزیفەو تەحقیقاتدا معاونەت بكەن تەعینی مومەسلینی تەكلیف كرد. لە پێش حەرەكەتدا ئاگەهدار كرا كە قوماتدانی ئۆردوی مەنتیقەی دیاربەكر جەواد پاشا بەمەعاون و لە ریفاقەتیا یەك دوو ئەهلی خیبرەیش تەعیین كراوە.

لەدواییدا هەیئەت بۆ قونبە حەرەكەت وە لەوێ لەگەڵ رەئیسی جمهوری توركیا مستەفا كەمال پاشادا مولاقاتی كرد. وە لە رێی سوریەو شامەوە بۆ بەغدا حەرەكەت و لە (١٦) كانونی سانی رۆژی جومعە مواسلەتی بەبەغدا كرد.

هەیئەت بۆ چەند رۆژێ مانەوەی لە بەغداو موسڵ كەسبی مەعلومات لەسیاسەت و ئەحواڵی ئیداریەی حكومەتی تازە ئیجرای تەدقیقات كرد. ئەو مدەتەی كە لە بەغدادا بوون لەماڵی مەندوبی سامی عێراق سێرهانری دوبس میوان بوون . جەنابی سێر هاتری دوبس جەواد پاشای لەدار ئەلئیعتماد میوان كرد وەموتەباقی ئەهلی خیبرەی تورك لە جێگایەكی تر موسافر بووبون.

لە دواییدا موعتەمەدی سامی میستەر جاردینی لە تەرەفی حكومەتی بەریتانیاوە بە سیفەتی معاون وە وەزیری ئیشغالی عمومیەی سابیق سەبیع نەشئەت یەكێ بە ناوی مومەسیلی عیراقەوە تەقدیمی هەیئەتی كرد.

هەیئەت رۆژی دووەم لەگەڵ جەلالەتی مەلیك فەیسەڵدا مولاقات وە حەزرەتی مەلیك دائیر بە حدودی مەملەكەتی چەنەزەریەی خۆی و چەنەزەریەی حكومەتەكەی سەردو بەیان كرد[٢٣] .

مەلیك فەیسەڵ لە كاغەزێكدا بەیاناتی ئاتی‌یەی رەسمەن نارد لەم بەیاناتەدا تەلەبی حقوقی مەشروعەی عیراق، مەدەنیەتی پێشوی میللەتی عەرەبی زەكر، شان و شەرەفی زەمانی پێشوی خولەفاكان و مەركەزی مەدەنیەت بوونی تەزكار، حەرەكاتی وەتەنپەروەری عەرەبی خەلاسە، لە عەرەبی عمومیدا عەرەبەكان بۆ ئەمەی ئیلتیحاقی ئیئلافەكان بكەن لەو فرسەتە هەڵكەوتووانە بە چەسورەتێ ئیستیفادەو دەركردنی موتەغەلیبەكانی بەیان كردبوو. لە دوای ئیمزای وتارەكەو خۆ كێشانەوەی توركەكان بۆ شیماڵی حدودی عیراق و لەو وەختەدا سەرابەت كردنی ئیشغالی عەسكەری ئینگلتەرە لە بەسرەوە بۆ بەغدادو بۆ موسڵ تەسریع و بەیان كرد (لە پاش ئەم ئیشغالە) ووتویەتی:

(حكومەتی بەریتانیا لە پارلمنتودا ئیزهاری نیەتی كردووە كە حكومەتێكی عەرەبی تەشكیلە وە ئەو وەعدەی كە بە عەرەبەكان درابوو بەجێ بهێنرێ). لەو رۆژەوە تا ئێستا چوار ساڵە ئەم حكومەتە تەشكیلی كردووە مومەسیلی حكومەتی بەریتانیا لە حزوری مەجلیسدا عەلەنەن نەی ووت كە عێراق بەم نزیكانە ئەتوانێ سەربەخۆ ئیدارە بكا؟ وە قبوڵیان لە جەمعیەتدا ئارەزوو ئەكەی.من موتەرەدید نیم كە هەیئەت فەرقی ئیدارەی حازیرە وە ئیدارەی سابیقە حەز كردوە بۆ مەملەكەتەكەم كە لەبەینی تەبەقاتی موختەلیفەدا لەسەر عەدالەت و مساوات و دین وەمەدەنیەت تەئسیسی كردوە حدودێكی سابت بەشەرەف تەئمین بكرێ و ئەو وەقتە بۆ تەزبیتی سەروەتی تەبیعەتی لە بەزلی هیممەت و مەساعی زیاتر هیچی تری پێویست نییە. لە ئاخریدا بەحسی سورەتی ئیرواو ئیسقای دیالەو فورات كەزراعەتی سێ ملیۆن فەدان ئەرازی تەئمین ئەكا، وە لە خەتی

شەمەندەفێری بەغداد-موسڵ کە لە کفری و کەرکوکەوە تەمدید ئەکرێ وە لەسەر تەواو بونە، وە بەیانی کرد کە حکومەت و مەملەکەتەکەم بۆ دەرهێنانی نەوت خەریکی عەقدی مقاولە نامەیەکن لەپاشا چوە سەر بەحسی عیلاقەی موستەقبەلی عیراق و تورکیا وە ئەڵێ:
ئێمە ئیحترامی میللەتی تورك و سەعادەتی تەواویان بۆ تەمەننا ئەکەین لاکین ئێمە بۆ ئەمەی بەسەعی و قوەتی بازوی خۆمان خزمەتی بەشەرییەت بکەین ئارەزو ئەکەین لە پەنای ئەمنیەت و موسالەمەتتدا وەبژین بۆ بەجێهێنانی ئەم ئارەزوەیەمان لازمە حدودێ دابنرێ کە لە تەجاوزات موحافەزەمان بکاو ئەمەیش مەسئەلەی حەیات و مەماتە.
مەلیك لە نوقتەی عەسکەری، ئیقتیسادی، جوگرافی، قەومیەت و میللەتەوە لە حەین تەدقیقاتەتدا لێی مەعلوم بوە کە عیراق لە حدودی تەبعیەی خۆی مەحروم بکرێ زەربەیەکی گەورە لەموقەدەراتی مەملەکەتەکەی ئەدرێ. ئەنجا بەم نەوعە نیهایەتی بەبەیانەکەی هێناوە.
بۆ تەئییدی حکومەتێکی سابیت لە عیراقدا و بیخسوس بۆ تەئمینی شەرەفی ئەم حکومەتە مەربوتی موحافەزەی وەزعیەتی حازرەیە. من چە لە نوقتەی ئیقتیسادییەوەو لە نوقتەی عەسکەرییەوە لەم فکرەدام کە ئەگەر موقەررە موسڵ لە عێراق جوی وە بە حکومەتێکی ئەجنەبی بدرێ لە بەغدادا دەوام و قەراری هیچ حکومەتێك مومکین نیە، لەگەڵ ئەمەیشدا عێراق بەبێ موسڵ شەرەفێکی نیە، لەبەر ئەمەی کە من لە حسیاتی تورك و لە فتوحات و ئارەزووی تەوەسوعیان وقوفم هەیە کە ئینفسالی موسڵ گەورەو بەقوەت تەئمینی موسالمەت مومکین نابێ کە ئینفسالی موسڵ لەعێراق موقەرەبێ جەمعی ئەم ئۆردویەیش مەحاڵ ئەبێ ئەو وەختە کە مەملەکەت دائیمەن مەعروزی ئیحتلال و شەڕو شۆڕ بوو چۆن مەیسەر ئەبێ کە سەرمایەی ئەجنەبی بۆ ناو مەملەکەت بهێنرێ؟!
لەبەر ئەمە تەئکید ئەکەم کە موسڵ بۆ عێراق لەبابەت سەرو لەشدایە! ئێستا کە مەسئەلە هەرچەندە زاهیرەن مەسئەلەی حدودی بەینی تورکیاو عیراق فەقەت حەقیقەتی حاڵی مەسئەلەی موقەدەراتی هەموو عێراقە!..
ئینجا ئێستا رەفاهو سەعادەتی چوار ملیۆن نەفس لەدەست ئێوەدایە، ئەگەر ئێوە لەبەر هیچ سەبەبێ بێ فکری تەعدیلی حدودی حازرەی عێراق بە جەمعیەتی ئەقوام بەیان بکا لەبری ئەمە مەسئولیەتی موقەدەراتی ئەم میللەتە لێکبداتەوە وە بۆ عێراق فکرو سیاسەتێکی تازە بەجەمعیەتی ئەقوام بەیان بکا.
هەر ئەو رۆژە هەیئەت لەماڵی مەندوبی سامی جەلسەیەکی عەقدکرد لەم جەلسەیەدامەندوبی سامیش حازر بوو. وەقعەیەك بوو بەبابەتی (١٥) رۆژ دواکەوتنمان چونکە مەندوبی سامی بەیانی کرد کە لەناو ئەهلی خەیرەی تورکدا لە خەلقی عێراق عێراق نازم و فەتاح بەگ کەبە حەرەکاتیان لە عەلەیهی حکومەت حازر بوون وە لەمانە یەکێکیان وەختی خۆی لە حەینی تەوقیفدا فیرارە وە ئەمرۆ لە حزوری هەیئەت بیلئیستفادە داخیلی عێراق بوون موحتەمەلە ئەمانە خەلەل بە ئەمنیەت وە ئاسایش بگەیەنن لەبەرئەمەی کە وەتەن وە میللەت پەروەران تەهدیدیان ئەکەن وە ئەبنە باعیسی هەیە جان ئیعادەیان تەلەب ئەکەم.
هەیئەتی بەیانی تەئەسوفی کرد لەمەوجود بوونی ئەم دوو کەسە لەناو هەیئەتدا کەوا هەم لە نەزەری حکومەتی عێراقدا موجریم و هەم خەلەل بە وەزیفەی هەیئەت

ئەگەیەنیٚ، فەقەت لەبەر ئەمەی کە ئەمانە خەلقی ویلایەتی موسڵن تا وەکو مەسئەلەی حدود تەواو نەبیٚ جائیزنیە بە تەبعەی عێراق عەد بکرێن.

لەپاشا مەعاونی تورك جەواد پاشامان لە مەسئەلە خەبەردار کرد، بۆ گۆڕینی ئەمانە موناسەبەمان نەبینی ئیسرار لە حکومەتی تورك بکەین. لەم ئەسنانەدا جەواد پاشا خەبەری دایێ کە ئەمەلی خەبەرەکانی خراونەتە مەوقعێکی موستەحکەم وە لەژێر نەزارەتدان لەم مەعامەلە غەیری مەئمولی نەزەری دیقەتی مەندوبی سامیمان جەلب کرد. کە چوینە ئەویٚ دیمان کە ئەو مەوقیعە یەك دوو کلیۆمەترە لەدوای شار وە بەتەل ئۆرگۆی عەسکەری موحاتە. بەتەوەسوتی ئێمە ئەهلی خیبرەکان... خانووەکان نزیك دار ئەلئعتیماد وە لە خسوسی نەچوونە دەرەوەیان مەندوبی سامیان تەئمین کرد.. چونکە لەبەر ئەحواڵی خسوسیەتی بەغدا ئەم تەدبیرەمان مەعقول بینی بوو وەلاکین عەلەنەن بەیانمان کرد کە گەیشتینە مەحەلی مونازع فیهی بۆ حەرەکەتی هیئەتی تورك بە کەماڵی حوریەت ئیسرار ئەکەین.

ئەم وەقعەیە لە بەغدادا ئەوەل وەقعە بەناردنی موزەکەرەیەك بۆ موعتەمەدی سامی حکومەتی بەریتانیا وە بۆ جەنەڕاڵ جەواد پاشا ئاخیری هات.

جەوابی فەخامەی موعتەمەدی سامی وە مەساعی جەنەڕاڵ جەواد پاشا هەیئەتی بەحسیاتی ئاتیە موتەحەسیس کرد:

١-جمهوریەتی تورکیا بۆ معاونەت و یاریدەدەری هەیئەت لە تەعین و ئیلحاقی ئەم دوو شەخصە کە موحارەکاتی سیاسیەیان بەوە وەزیفەیەکی وانازك ئالایق بوونیان تەبەنیی کردووە بەیانی تەئەسوفی لەم بیٚ موناسەبتیە ئەکا ناونەبردنی ئەم دوو شەخصە لە موزەکەراتی مەجلسی ئەستەمبوڵدا کافی بوو بۆ تێگەیشتنی هەیئەت کە ئەمانە ئەبنە باعسی موشکیلات و تێکدانی وەزائیفی ئێمە.

٢-حکومەت کە لەئەمنیەتی عمومییە مەسئولە، لەبەر ئەمەی تەشەبوسی کردووە بە ئیتیخازی تەدابیری لازمە بۆ تەئمینی ئەمنیەت و موحافەزەی شەخصی ئەهلی خیبرەی تورك کە وا بۆ هەیئەت هەتا لە خاریجی مەنتقەی مونازع فیهی بیٚ تەدابیری لازمەی خسوسی وەرناگریٚ.

٣-هەیئەت ئەو مودەتەی کە لە موسڵ وە یا لەجیهاتی سائیرەی ئەرازی مونازع فیهی دابیٚ قەناعەتی پەیدا کردووە کە لە حزووری هەیئەتدا بۆ مودافعەی نەزەرییەی حکومەتەکەی بە سورەتیٚ کە موناسیب ئەبینریٚ ئەهلی خیبرەی تورك بە حوریەتی تامە موستەفیدبوونیان ئیجاب ئەکا. لە بەر ئەمە ئەبیٚ هەموو وەختیٚ بە کەماڵی حوریەت لەو کەسانەی کە موناسب ئەبینن وە یا لە دەستەو دائیرەکانیان تەلەبی معاونەت وە ئیستیفادە بکەن. بۆ ئیکماڵی ئەم شەرائیتە ئەهلی خیبرەکانی تورك لە ئیش و کاریاندا لازمی سەربەستیەتی تەواویان پیٚ ببەخشریٚ.

هەیئەت لە دوای ئیستیشارەی جەنەڕاڵ جەواد پاشا، بۆ ئەمنیەتی شەخسیەی ئەو کەسانەی کەل موعینیایە دەرحەق بە وەرگرتنی تەدابیری لازمە لەگەڵ حکومەتی مەحەلیەدا ئەتفاق وە حقوقیاتی محافەزە کرد.

هەیئەت قەناعەتی پەیدا کردووە کە تەرەفەین بە مەدخەل دەرك وە حەسیان کردووە لە ئەسنای وەزیفەدا تووشی سعوبەت و مشکیلات بکرێن لە تێکدانی رەوشتی

تەحقیقاتی مەودوعە زیاتر هیچ نەتیجەیەك نابەخشێ، لەبەر ئەمە بۆ حەلی مونازەعە بە سورەتێكی مەستەعجەل ئومێد ئەكەین كە هەردوو لا دەست هەلگرن لەو موعامەلاتانەی ئەبێتە باعیسی تەئخیر بوون.

هەیئەت ئەو مدەتەی لە بەغدادا بۆ ئیجابەتی دەعوەتی حكومەتی عیراقی كرد، وە چەند وەزارەت، وە مەكتەبی حەربیە، وە خەستەخانەكان، وە دەوائیری مەعاریف، وە مەكتەبی زەراعەتی زیارەت كردن، وە ئیستحسالی وە سائیق كە عائیدی مەناسەباتی تیجاری بەینی بەغداو ئەترافی وە ئەجزای شیمالیەی عەلاقخانەكان وە مەیدانی دارفرۆشەكان گەڕا رابیتەی ئیقتسادی سابیقەی بەینی بەغداو موسلی رای ئەلعەینی حقیق، وە ئیحسائیاتی گومرگی بە دیقەت تەماشای راپۆرەكانی قونسولخانە كە لە پێش حەربدا تەنزیم كرابوو تەفتیشی كرد. بەم نەوعە دائیر بە ئەحوالی ئیقتسادی مەملەكەت گەلێ وەسائیقی دەستكەوت.

لە پاشا هەیئەت بە خەتی شەمەندەفیری شەرقات كە جەبەل حەمرین تەعقیب ئەكا وە توركەكان بە حدودی تەلەبیان كردووە بۆ موسلْ حەرەكەت، وە لە (٢٧)ی كانونی سانیدا پاش نیوەڕۆ بە موسلْ مواسلەتی كرد. لەو خانووەدا موسافیر بووین كە مەلیك فەیسەلْ لە حەینی سیاحەتی موسلیا ئیقامەتی تیا كردبوو. لە ئەسنای مواسلەتدا حادسەیەكی تازەی موكەدەر[٢٤] رووی‌دا قونت تلەكی ئەمەی لە بەیاناتەكەیدا تەوسیف كردووە.

خولاسەكەی ئەمەیە:

(٢٧)ی كانونی سانی- رۆژی گەیشتنی هەیئەت بە موسلە.

لەگەلْ موسیو شاریر وە موسیو رودرلۆدا لەناو شار ئارەزووی گەڕانم كرد.كە لە مالْ هاتمە دەرێ جەواد پاشام بە جلی عەسكەریەوە دی وە لە گەلمانا بۆ گەڕان قبولْ كردنی تەلەب كرد. بەو ئیشتیاق‌و فكرەوە كە بزانم ئەم ئەلبیسە رەسمیانە چە نەوعە تەئسیراتێك بەسەر ئەهالیدا ئیجرا ئەكا ڕەفاقەتیم قبول كرد. داخیل بە كۆلانەكانی شار بووین فەقەت هێشتا پۆلیس تەعقیبی نە ئەكردین (٣٠) كەسێ كە بە عەرەب تێیان گەیشتبووم نزیكمان بوونەوە. دەوروپشتی جەواد پاشایان گرت‌و دەستیان ماچ كرد وەبە نیدای (بژی توركیا) وە چەپلە ڕێزانیان كرد.

قەرەبالغی لە پشتمانەوە زۆر بو تا گەیشتە دوسەد كەسێ هاوارو دەنگ بەم نیسبەتە زیاد بو. لە دوای تێپەڕبونمان لە قشلەی عەسكەری چەند پۆلیسێك دەستیان كرد بەبلاوكردنەوەی قەرەبالغیەكە.

كە گەیشتینە ناوبازاڕ-٣- قۆمیسەری پۆلیس كەوتنە تەكمان لەمانە یەكێكیان ئینگلیز بو. ئەو ئیزدیحامەی كە شوێنمان كەوتبون لە بازاڕیشدا چەند كەسێكی تری چوە سەرو هەتا ئەهات زۆرتر ئەبون. جەواد پاشا سەرلەنوێ مەعروزی نمایشێكی تر بو وە چەپلە ڕێزان كرا. نمایش كەران دیاربون كە لە عەناسری موخالەفەن قسمێكی زاهیرەن ئەلبسەی مونتەزەمی چاكیان لەبەردابو وەقسمێكیان سفیل‌و فەقیر دیاربوو. كۆمەلێك منالەوردكەیش تێكەلی ئەمانە بون. ئیتر ئەفرادی پۆلیس مەجبوری بلاوكردنەوەی ئەمانە بوو.

لامێن معلوم بو کە ئیزدیحامەکە ئیتاعەتی ئەوامیری پۆلیسی کرد، لەم ئەسنایەدا حسمان کرد کە دوپۆلیس بەدار لەخەڵق ئەدەن، یەکێك لە پۆلیسەکان پەلاماری شەخسێکی دابو کە ئیلتیجای بە دوکانێك کردبوو وە لەبەر چاومان بە دار لێیدا موداخەلەم بە وەزیفە بینی بانگی یەکیٚ لە قۆمیسەرەکانم کرد وە پێم ووت: (لە حزوری یەکیٚ لە ئەعزایانی هەیئەتی جەمعیەتی ئەقوام لە خەلق لێدان مەنعت دەکەم!).

روو بە دائیرەی بەلەدیە لەسەر رۆیشتن دەوام کرا، ئەوانەی دوامان کەوتبوون هەر روو لە زیادی بوو. ئەفرادی پۆلیس مەنعی ئەمانەی ئەکرد. وەختیٚ گەیشتینە قلوبی وەتەنی عیراق کە بەرامبەر بە دائیرەی بەلەدیەیە عەکسی ئەوەڵی نمایشێکمان بینی کە تاقمیٚ تەلەبەی مەکتەب بۆ پێشەوە بەرەو پیرمان ئەهات بەیاخی عیراق بە دەستەوە چەپڵەڕێزانی مەلیك فەیسەڵیان ئەکرد. لە دوامانەوە قەرەباڵغی، لە دەوروپشتمان ئەفرادی پۆلیس بەم سورەتە گەڕاینەوە جیٚی خۆمان.

لەسەر ئەم واقعەیە هەیئەت سبحەینیٚ بەیانی لەگەڵ موتەسەریفی موسڵدا مولاقات کردنی قەراردا. موفەتیشی ئیدارەی بەریتانیا مێجەر لوئیدیان لەگەڵابوو، بەرامبەر بە نمایشی ئەهالی... پەروەر کە ئان بە ئان روو لە زیادی بوو بۆ پاراستنی حەیاتی هەیئەتی مەرەخەسەی تورکیا داوای قوەتێکی موحافەزە کرابوو بۆ ئەمە تەدابیری ژێرەوە وەرگیرا.

١-جەواد پاشا و مەعبەتی کە ئارەزووی هاتنە دەرەوەیان کرد حکومەتی مەحەلیە ئاگەهدارە وە ئەو جێگایەی کە چوون پێویستە مەعلومی بکەن، ئەو وەختە موحافیز لەگەڵیا ئەنێریٚ .

٢-لە جەواد پاشا بەجلی عەسکەرییەوە نەچووە دەرەوە پێویستە.

٣-لە تەرەفی هەیئەتی تورکەوە بۆ نەکردنی هیچ مناوەریەك کە باعیسی تێکدانی ئینتیزامی عومومی بەمەرجەعی عائیدەی تەدابیری لازمە وەرئەگریٚ.

لەبەر ئەمە هەیئەتی ئارەزووی تەئمینی حوریەتی تەواوی خیبرەی تورکیان بوو... توانی شەرائیتی حکومەت قبول بکات. دەستبەجیٚ بۆ موفەتیشی ئیداریو موتەسەریف ئەمەی نووسی:

١-ئێمە ئەمانەویٚ بەبیٚ ئەوەی ئەفرادی پۆلیس بە ئاشکرا لەگەڵیا نابیٚ حوریەتی ئەعزای تورکیا تەئمین بکریٚ. بەم نەوعە هەرچەندە خەفی لیٚیان ئەپرسیٚ بۆ حزوری هەیئەت شاهیدهێنانیان لیٚ داوا ئەکەین.

٢-ئەبیٚ بەلەدیە ئەمنیەتی هەیئەتی تورکیا تەئمین بکا عەلەنەن پاراستنی ئەمانە قبوڵ ناکەین، ئەم پاراستنە ئەبیٚ بە نەوعیٚ بیٚ کە خەڵك تیٚ نەگەن.

٣-هەیئەت ئەم داوایانەی دەست نەکەویٚ دەست بە ئیش ناکا موفەتیشی ئیداریو موتەسەریف هەرچەندە ئەم بابەتانەی دی فەقەت تاکو لەگەڵ مەرجەعی مەخسوسیا موزاکەرە نەکریٚ جەواب نەدا ئەوەیان بەیان کرد.

لە دواییدا موعتەمەدی سامی بە تەلەغراف جەوابی دایەوە هەرچەندە ئیعترافی کردبوو کە داواکەمان حەقە فەقەت روودانی هیچ حەرەکەتێکی دژمنانە کە بۆ هەیئەتی تورکیا باعیسی زەرەر بیٚ، بەریتانیاو عیراق لەمەدا مەسئولیەت قبول نەکردنی بەیان کردبوو.

لەم وەقتەدا، لە ئەنقەرەوە بە تەلەغرافێك بەرامبەر هەیئەتی تورکیا ئەم وەزعیەتەی عێراق پرۆستۆکرا لەم تەلەگرافەوە ئەڵێ: "قوەتی ئیشغالیە لە تەئمینی هەیئەتی تورکیا مەسئول بوونی ئیجاب ئەکا" بەم مەعنایە بەواسیتەی سکرتێری جامیعەی ئەقوامەوە پرۆتۆستۆنامە یەکتریمان لە حکومەتی تورکیاوە بۆ هات ئێمەش لە تەگرافێکی دووررو درێژمان بۆ جنورە[٣٥] نووسی ئەم حاڵەی کە لەغەیری موناسیب ئینیخاب کردنی ئەهلی جیرەکانی تورکەوە روویدا بوو تێمان گەیاندن سورەتێکی ئەم جەوابەیشمان بۆ ئەنقەرە ناردەوە وتمان ئەو شەرائیتەی کە حکومەتی عێراق دەر بەیانی کردووە تا حکومەتی تورکیا قبوڵی نەکا لەعێراق داوای تەئمیناتی شکلین.

هەیئەت رۆژ بەرۆژ لە تەحقیقدایە وردتر ئەبۆوە چەند کەس کە بۆ تورك مەیلی نواندبوو خەبەری حەپسیان وەرگێرپا بیلزات ئەعزاکانی هەیئەت لەژێر تەجەسوس و موراقەبەدابوون لەو خانووەوە کە تێدابووین: دوو نوقتەی پۆلیسی لێدامەزرابوو ئەمانە لە هاتووچۆی ئەعزاکان و سکرتێری مەرکەزی بەتەلەفۆن و خەبەردار ئەکرد هەیئەت تێگەیشت کەلەژێر ئەم شەرائیتەدا کردنی تەفتیشاتێکی بێ غەش مەحاڵە تا دەوام ئەم حاڵە دەست بەئیش نەکردنیانی بە میستەر جاردین و جەواد پاشا خەبەردا.

لەم وەقتەدا هەرچەندە لەگەڵ حکومەتی ئەنقەرە موخابەرەکرا فەقەت بەرامبەر بەموتالەعاتی هەیئەتی جەوابێکی وازیع وەرنەگیرا ئاخیری جەواد پاشا بۆ ئاسانی ئیش و کاری هەیئەت لەسایەی هیمەتی شەخسی خۆیەوە تا هاتنی جەوابی قەتعی لە ئەنقەرەوە مەسئولییەتی ئەمنیەت هەیئەتی تورکیای گرتە ئەستۆی خۆیەوە بەنەوعێ کە خەلەل بە حوریەت و حەرەکەتی هەیئەت نەکا قسمێك لەشەرائیتی خسوسی ئەمنیەت قبوڵ کرد لەدوای دوو رۆژ هەرچەندە جەواب لە ئەنقەرەوە هاتەوە لاکین لەبابەت قبوڵی مەسئولییەتەوە هیچ سەراحەتێکی تیا نەبوو لەبەر ئەمە ئەم تەلەغرافەمان نارد:

**موسڵ ٨ی شوباتی ١٩٢٥:**

**ئەنقەرە ـ ت ٣ ئەنزەراتی ئموری خاریجییە:**

ئەو تەلەغرافەی کە نەزەرییەی جەواد پاش بەعەینی نەزەرییەی تورکیا تەلەقیکردنی تیا نووسرابوو وەرگیرا. جەواد پاشا ـ لەسەر داوای ئێمە ـ ئەم وەرقەی کەلە ژێرەوە نوسراوە وە لە ٦ی شوباتدا پێمان سپێررا، لەنەزەری حکومەتی تورکیادا موعتەبەربوونی ئیستدلال کرا.

بەناوی خۆم و حکومەتەکەوە، تا جەوابی قەتعی ئەو سوئالانەی کە لەحکومەتی ئەنقەرەوە پرسراوە دێتەوە مەسئولییەتی سەلامەتی شەخسییەی هەیئەتی تورك ئەگرمە ئەستۆم، وە بەیاناتی موعتەمەدی سامی کە ئەگەر بە عەدالەت ئیجرا بکرێ و تەئسیر نەکاتە حسیات و نفوزی هەیئەتی تورك، ئەو تەدابیرە موحافەزەیە کە بۆ موعاوەنەت و ئیجرای وەزیفەتان وەرگیراوە قبوڵم کرد:

ئیمزا
جەواد پاشا

هەیئەت، لەگەڵ موعاونەکانی بۆ دەوامی تەحقیقات بەرامبەر بەم تەسهیلاتی حکومەتی تورکیایە موتەشەکیرە.

دەوپرسەن

هەیئەت هەرچەندە لە ١٦ی کانوونی سانیدا مواسڵەتی بەبەغدا کردووە، وە ئەمڕۆش پێنجی شوباتە فەقەت هێشتا بەدامەزراندنی پرۆگرامی وەزیفەکەی مۆفەق نەبووە تەبەلیغی موخەمینەکان کرابوو کە تاوەکو مەسئەلەی ئەمنیەتی شەخسییە بە سورەتی قەتعیە حەل نەکریٚ گویٚ لە هیچ شاهیدیٚ ناگیریٚ، وە هیچ جەمعیەتیٚ قەبوڵ ناکریٚ. هەرچەندە دەست بەئیش نەکرابوو لاکین ئەعزاکان لە زەرفی ئەم مدەتەدا بەسورەتێکی خسوسی ئەفکارو حسیاتی ئەهالی قسمن پشکنین،بۆ گەڕانی دەورو پشتی شارو داخلی ویلایەت پڕۆگرام ڕێکخرا. وە دەرحەق بە ئسولی تەحقیقات لەبەیندا ئیتفاق پەیدابو. دائیر بە ئەحواڵی مەملەکەت بۆ ئەمەی مەعلوماتێکی عمومی دەست بکەوێت ناو بازاڕ، حەپسخانە، وە بەعزیٚ جێگای تر وە لەگەڵ گەلیٚ لە موعتەبەران وەئەشراف وە ساحێبی مەعلومات -بە بیٚ ئەمەی کەسیان لەگەڵدا بێت-زیارەتیان کرا، بەم سورەتە لەگەڵ ئەمەی کەمەیدانی تەتبیقاتو پڕوپاگەندەی هیچ لایەك نەدرا، دائیر بەئەحواڵی شار مەعلوماتێکی عمومییە پەیداکرا هەیئەت لەپاش ئەوەی شەرائیتی تەحقیقاتی ڕەسمی دەستکەوت هەرسیٚ ئەعزاکان بەیەکەوە ئیشتراکی ئەمەی کرد. هەیئەت ئیستینتاقی حەسر نەکردبوە سەر ئەربابی سەنایع کەوەکو ئەتباع، توجار، وە جەمعیاتی سیاسیە وەسائیرە بیٚ لەهەموو تەبەقەی موختەلیفەی ئەهالی پرسیار کرد.

بێجگە لەهەیئەت لەمیستەر جاردینو جەواد پاشا لیستەی ناوی ئەو شاهیدانەی کەئارەزوی گویٚ لێگرتنیان بو داوای کرد. بەم نەوعە هەیئەت وردە وردە تەحقیقاتی پێکراوە لە هەموو کەس عامو خاسی ئەهالی پرسی کرد. لەپێش پرسینی سوئالەکان ئەو نوتقەی کەرەئیس بەرامبەر بە هەیئاتو ریجالی موسڵ دابوی بۆ ئیستیفادە لێرەدا دەرەجی ئەکەین.

لە زیارەتتان و تەشریف هێنانتان موتەشەکیرین. هەیئەت لە مەسئەلەی حدودی موسڵدا بەبیٚ ئەمەی مەیل بەهیچ لایەك بنوێنیٚ ئارەزوی کردنی تەحقیقاتێکی بیٚ غەشی هەیە، لەم فیکرو ئارەزویەدا هیچ مورشیدیٚ نییە لەگەڵ ئەمەشدا ئەمانەویٚ وەحەز ئەکەین کە بزانین میللەت سەعادەتی حەقیقی خۆی لە چ لایەکدا ئەبینیٚ. هەیئەت لە ئیشو کاردا لە تەرەف ئێوەوە ئومێدی تەسهیلات ئەکا، وە ئەیەویٚ کە هەموو کەس بە کەمالی حوریەتو سەربەستی فکرو ئارەزووی خۆی بەیان بکا لە موستەقبەلدا حکومەتی هیچ لایەك ئەبیٚ با بەبیٚ نەزەری دڵتان ئەهێنمە سەر ئەوانەی کە موخالیفی شەهادەت ئەدەنو بە کردەوەیان بۆ مەملەکەت نەتائیجی وەخیم پەیدا ئەکەن.بە هەموو هێزو قوەتتان سەعی بکەن بۆ دەوامی سکونەت لە ناو میللەتدا وە لامان وایە مەنعی قیامو نمایشی ئەو گەنجانە ئەکەن کە لەگەڵ سیاسەتدا بیٚ عیلاقەنو ئەبنە باعیسی تێکدانی ئاسایش.

ئەوانەی ساحیبی مەوقیعی بەرز بوون لە حزووری هەموو هەیئەتدا، وە ئەوانەی تر یەکە یەکە لە حزووری یەکیٚ لە ئەعزاکاندا گویٚیان لیٚ گیرا بەم سورەتە هەیئەت

میقداریکی میهیمی ڕای کۆکردەوە. موبالەغە نییە ئەگەر بڵێین هەیئەت دەرحەق بە موسڵ حەسەب ئەلئیمکان بە تەواوی ئاگەهداری فیکری ئەهالی بوو.

نەزەرییەی حکومەتی تورك مەبنیە لەسەر لزومییەتی مشورەت لەگەڵ ئەهالی عیلاقەداردا، حکومەتی ئینگلتەرەش ئەهمیەتی ئەمەی تەسریح کرد، لەبەر ئەمە هەیئەت بۆ تێگەیشتن لە فیکری ئەهالی بە سورەتێکی واسیع وە بە دیققەتێکی تەواو لزومی بە سەعی نەبینێ.

ئەم سوئالەی (تورکیا یان عیراقی دەوێ) کە بۆ ئیستفسار وە پرسینی ڕای ئەهالی دامان نابوو لە پێشدا وا هاتە بیرمانەوە کە بەعزێ مەسائیل و مەوادی میهمی لێ پەیدا ئەبێ. سەرەڕای ئەمە لە ئەسنای را وەرگرتندا دەرحەق بە ئیدارەی ویسایەت، وە دائیر بە نیزام نامەی مەعاهەدەی بەریتانیا-عیراق بە پرسینی بەعزێ نوقات لزومیەتمان حەس کرد بەرامبەر بە بەعزێ سوئالاتمان ئەو تیلەغرافەی کە لە ڕەئیسی وزەرای عیراقەوە وەرگیرا تووشی موشکیلاتی کردین. جەوابی تەلەغرافی مەزکورمان بەم نەوعە دایەوە بەبێ ئەمەی هیچ مانعەیەك نەیەتە سەر ڕێ هەموو نەوعە مەسائیلێ کە موتەعەلیق بێ بە موقەدەراتی مەملەکەتەوە بە سورەتێکی ورد کردنی تەحقیقاتی لازمە داخیلی وەزیفەمانە. میللەتێك کە لە مەبدەئی تەربیەی سیاسیە دابێ، وە لە بەینیاندا پروپاکەندەیەکی بە قوەت نەشر کرابێ ئسولی ئیستفتا لە ئەفکاریاندا ئەبێتە موجەب هەیەجانی ئەم جهەتە لێرەدا دیسان بەیان ئەکەین. لەبەر ئەسبابی مەزکورە بۆ تەسریعی ئیش و کارمان کە زۆر دواکەوتووە. وە بۆ تەحقیقاتی لازمە، ڕەوانەکردنی چەند شوعبەیەك بۆ ئەم لاو ئەو لای مەنتیقەی مونازع فیهی، وە بۆ بینینی وەزیفەی هەموو لایەك بە یەکەوە موافەقەت پەیدا بوو، وە ئەم تەدبیرەش ئەمریکی بەدیهیە. خسوسەن ئەعزای هەیئەت لەسەر ئیجرای ئسولی ئیستجواب موافقەتیان کردبوو. ئەم موافەقەتەیان لە ئەسنای بینینی ئەوەل وەزیفەیان لە موسڵ حەس کرا. لەگەڵ ئەمەیشدا، تێ گەیشتین کە شاهیدەکان لە حزوری هەیئەتدا بەتەرەددو تەحەیورەوە جەواب ئەدەنەوە. با خسوس ئەم نەوعە ئیستفتایە فائیدەیەکی تری بوو کە پۆلیسەکان ئاگەهدار نەئەبوون. عەلاوەی ئەمەش حەس کرا کە غەیبوبەتی سکونەت بەسەر ئەفکاری ئەهالی شاردا ئەهێنێتە وجود. ئەگەر هەموو ئەعزاکانی هەیئەت بەیەکەوە لەجێیەکەوە بۆ جێیەکی‌تر بچوایە لەوسائیتی نەقلیەدا سعوبەت، کەمی وەنەبوونی مەساکینی لایقە ئەبووە باعیسی تەئخیر بوونی تەفتیشات وەمانەوەیان، وەچوونی بەعزێ لە ناحیەکانیش مشکیل ئەبوو.

حازربوونی مەرەخەسی تورك و بەریتانیا تابعی ئارەزووی هەیئەت بوو. هەیئەت لە بردنی ئەمانە لەگەڵ خۆیاو لەبەجێ هێشتنیاندا موختار بووم. لە حەقیقەتداتووشی ئەزیەت نەهاتین چونکە لەم ناوەدا ریجالی ئیداری بەریتانیاو عێراق مەوجودە، وە لە ئەترافی موختەلیفە مەعلومەتیان هەبوو. هەر چوار ئەهلی خیبرەکانی تورك بەسەر شوعبەکاندا دابەش کردنی بە موناسیب دیترا.

وەختێ کە ئەم قەرارەمان بەمعاونەکان تەبیلغ کرد، لە میستەر جاریدن موزەکەرەی ژێرەوەمان وەرگرت: (لە نەتیجەی ئەو گفتوگۆیەی کەلەبەینی رەئیس و معاونی بەریتانیا جەرەیانی کردووە قسمێ لە ئەعزاکانی هەیئەت لەگەڵ مەرەخەسی بەریتانیا و تورکیا لەم

دوو شەمەیەی کەلەپێشمانەوە بە گەڕانی ئەترافی شار قەرار درا. معاونی بەریتانیا تێ گەیشت کە ئەو جێیەی چوونی مەقسودە لای ئاشکرا ناکرێ.
هەیئەت لەپێش سەفەرکردندا، پرۆغرامی وەزیفەو سەفەرەکەی تەعین و رێك ناخا. ئەگەر لەگەڵ هەردوو مومەسیلی تەرەفەیندا بچێ بۆ جێیەك لەوێ ئەڵبەتە هەیە جانێکی سیاسی دێتە وجود، وە حەس ئەکەم کە ئەم حەرەکەتەیش بەسورەتێکی مودهیش ئەبێتە باعیسی تێکدانی ئنتزامی عمومی، مەسئولیەتی ئاسایش و ئەمنیەتی مەملەکەت کە لە ملی حکومەتی بەریتانیا و عێراقدایە، معاونی بەریتانیا عەلەنەن بەیان ئەکا کە مەسئەلەی تەجاوزی سەلاحیەتی کردووە. لەبەر ئەمە کەیفیەتی عەرزی مەندوبی سامی عێراق ئەکرێ، وە لەم خسوسەوە ئنتزار کردنی ئەمری مەجبورییە.
معاونی بەریتانیا لە مکالەمەیەکی شەفاهیدا بۆ موحافەزەی سەلامەتی شوعبەکان یەکە یەکە لەگەڵیان قوەتێکی پۆلیس بوونی بەیان کرد، لەبەر ئەمە لە پرۆغرامی سەفەری شوعبەکان خەبەرداری تەلەب کرد، هەیئەت ئەگەر چ ئیعتیزاری لەم داوایەکرد کە بۆ ئیجرای تەحقیقاتێکی بێ غەش مانعە لاکین میستەر جاریدن بەبێ وەرگرتنی قوەتێکی کافی بۆ تەئمینی سەلامەتیان جەوازی سەفەر شوعبەکانی هەیئەتی نەداوەتە چوونە ژێر مەسئولێتیانی بەیان کرد، وە لەگەڵ سێرهانری دوبس مەندوبی سامی عێراقدا کە بۆ سبحەینێ هاتنی تەئیدکراوە لەم خسوسەوە مشورەت کردنمان تەلەب کرد.
لە ٨ی شوباتدا موعتەمەدی سامی لە بەغداوە هات ئیجتماعێکی سڕی لەگەڵ ئەعزایانی هەیئەتدا بەست، لەسەر تەلەبی موعتەمەدی سامی معاونی تورك و بەریتانیا بانگ کران و حازر بوون.
موعتەمەدی سامی وتی بۆ لابردنی ئەو ئیختلافەی کە لە ئسولی تەحقیقاتی هەیئەتەوە نەشئەتی کردووە هاتوومەتە موسڵ وەتەڵەبی تەحدیدی وەزیفەی. ئەهلی خیبرەکانی کردوو پرسی کە عەجەبەن ئەهلی خیبرەکان بەسیفەتی موتەرجمی ئیشتراکی وەزائیفی هەیئەت ئەکەن.
رەئیس جەوابەن وتی ئیستحسال وتەقدمی مەعولماتی موفیدە بە هەیئەت وەزیفەی معاونەکانە، وەزیفەی ئەهلی خیبرەکانیش لە یارمەتی معاونەکان عیبارەتە، بێجگە لەمەیش هەیئەت حەقی هەیە کە موباشەرەی ئیستخدامیان بکا چونکە بۆ ئیستحسالی مەعلومات وەرگرتنی هەموو نەوعە تەدابیرێ لەسەلاحیەتیایەتی لەگەڵ ئەمەیش کە موتەرجمێتی داخیلی وەزیفەی ئەسلییان نییە لە ئیستخدام کردنیان بەسیفەتی موتەرجیمی مانع نییە.
لەپاشا موعتەمدی سامی بەحسی لە حیمایەی معاون ئەهلی خیبرەکان کردووە وتی ئەخبار کرابووم کە جەمعیەتی تورك خواهەکان بۆ حیمایەوە موساحەبەی جەنەڕاڵ پاشا لە ئەسنای هاتنە دەرەوەدا نمایشی بۆ ئەکەن ئەم حەرەکەتەیان کە موجیبی ئیزتراب و تێکدانی ئاسایشە، مەنع وەرگرتنیان وەزیفەی پۆلیسە.
رەئیس بەیان کرد کە ئەفرادی پۆلیس مەنع کراون لەبڵاوکردنەوەی نمایشی وەتەن پەروەران، وە عەلاوەتەن قونت تلەکەی وتی: ئەگەر ئیعترازی ئەو معامەلە جێبەجێ باش دەست هەڵگیرابێت لەمەوافەق و قبوڵ بوونی ئەو تەدابیرەی کە پۆلیس ئینتیخازی کردووە لێی ئیستدلال ناگیرێ.

موعتەمەدی سامی بە حەماسەتەوە وەتەن پەروەری ئەهالی موسڵی تێی گەیاند وتی ئەمەلم هەیە لەمەودوا حەرەکاتو نمایشێ کە پێتە باحیسی تێکدانی ئیستراحەت هەیئەت روونەدا لەسەر ئەمە رەئیس وتی ئەم حەراکاتو نمایشە موجەبی ئەسەفە، نەك لەبەر ئەمەی بڵێی ئیستراحەتی ئێمە تێك ئەچێ، بەڵام لەبەر ئەمەیە کە ئەبێتە سەبەبی تێکدانو تەهیجی ئەفکاری ئەهالی. موعتەمەدی سامی تەسریحی کرد کە قابیلی ئینکار نی یە تەحقیقاتی هەیئەت، بینا بەم رەوشتەی کە لە موسڵدا لەسەری دەوام ئەکرێ، خاڵی نییە تەماسکردن بە نفوزو قوەتی حکومەتی بەریتانیاو عێراق لە هەمومی مەنتیقەی موتەنازع فیهی لەو تەقریرانەی بە بەغداد هاتووە دەرکەوتووە ئەو سوئالانەی هەیئەت لەئەکسەری شاهیدەکانی پرسیووە دەرحەق بەبێ قووەتی هەردوو حکومەتەکە بووە لەمەیش وا دێتە فکرەوە. کە هەیئەت سەعی ئەکا بۆ گرگرتنەوەی رای موخالفین ئیدارەی حازرەوە بووی بەیان کرا مەنتیقەی مەزکور لەژێر ئیحتیلالی یەکێك لەتەرەفەینی مونازعدایە، وە تەرەفی موحتەل بەسەر ئەولاداتەفوقی هەیە ئەم خسوسیە کە هەیئەت موزنەر ئەکا بە وەرگرتنی هەموو نەوعی وەسائیلێ کە ئارەزووی حەقیقەی ئەهالی لا تەئیید وە تەحقیق بکا.

وە بەیانەن ئەڵێم لە ئەسنای ئیش کردندا، لەبەینی هەیئەتو معاونەکاندا تەماسێکی تەواو لازمە کە واسیتەی حکومەتی مەحەلییەوە ئیجاری تەحقیقات وە ئیستیشارەی رای عام مومکینە.

رەئیس بەیانی کرد هەیئەت ئارەزوو و رەغبەتی هەیە بەنەزری ئیعتبار تەماشای بەیاناتی تەرەفەین بکا بەکەماڵی حوریەت وە مەوافیقی وجدانی تەحقیقات بکا بەهەموو حاڵی لازمە ئەو تەریقەی کە بۆ ئیجرای ئیشو کاریان وەرئەگرێ لەو تەقریرەدا کە تەقدیمی جەمعیەتی ئەقوامی ئەکا شەرحو ئیزاحی بکا وە ئەیزەن بەیانی کرد کە بەعزێ حەرەکاتی بێ جێ مانعی ئیشو کاری هەیئەت بوو، بە واسیتەی ئەو تەدابیرەی کە هەیئەتی پۆلیس بەبێ سەلاحیەتو ئیتخازیان کردبوو.

موعتەمەدی سامی گەڕایەوە سەر بەحسی بەیان کردنی سوعوبەتێ تەئمینی ئەمنیەتو موحافەزەی ئاسایش ئەو بەیانی کرد کە حکومەت حازرە موکالەفە بە تەدبیقی قەوانینی مورعیە لەو مەوقیعانەی کە لەژێر حوکمایەتی قونتەلەکی بە سیفەتی حقوقناسیەوە بۆی بەیان کرد کە قەوانینی عێراق عائید بە ئیدارەی مەملەکەت وە موحافەزەی نیزام بێ لە مەنتیقەی مونازع فیهدا تەنفیزی مومکین نییە.

موعتەمەدی سامی لەحەرەکاتی مومزەتەین پۆلیسی عێراق کە شوبهەی نی یە بۆ تەئیمینی ئینتیزام نواندبویان ئیعترازی کرد لەپاش ئەمە موعتەمەدی سامی تێگەیشت کە ئەحوالی مەجبور خەتای ئەکا وە مەسئولەی شایان دقەتە بۆ ئەمەی لە تەرەدودا نەمێنێتەوە ئیستیشارەی مەسلەحەت بینی. چونکە ئەو مەسئەلەیە لازم بووبێتە مەوزعی ئیعترازی حکومەتەکەی لەئەسنای مناقەشەی تەقریر لە مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەمدا. وە ملاحەزەی کرد حکومەتەکەی موافەقەت لەسەر قەراری هەیئەت نامێنێ کە وتراوە ئەعزاکان جوێ جوێ وە مونفەریدەن لە ئەقسامی موختەلیفەی ویلایەتدا تەحقیقات ئیجرا بکەن.

تەشكيل كردنى هەيئـەت لـە ئـەعزاى موختـەليفى ئـەلجنس دەلالـەت لـەوە ئەكاكـە مەجليس بۆ تەئمينى (مەوازنەتێكى تەواو) هەوڵيداوە.

وەلاكين موعتەمەدى سامى موتـەرەديدە كـە حكومەتەكـەى وە ڕاى عـامى بـەريتانى موناقيدى ئەو فيكرەبێ كـە جنسيەتى ئـەعزاى هەيئـەت خـاڵى لـە تەئسيرينە بەسەر ئـەو نەتائيجەى كە هەريەكە بەجوێ ئيستنتاجى ئەكەن.

ڕەئيس بەناوى خۆىو ڕەفيقەكانيـەوە وازيحـەن بـەيانى كـردوە ديقـەتى هێنانـە سـەر ئەوەى كە ئەم ملاحەزاتە لەجێ خۆى نييە. وە وتى مەسئەلە شايان ئيعتيمادە، مەجلس ئەعزاى هەيئەتى بە ئيتيفاقى ئارا تەعين، وە لە حەرەكەتيان دا حوريەتو سەربەستێتى و سەربەخۆى تەواوى پێ ببەخشێ وە لەسەلاحيەتى مومەسيلى حكومەتەكاندا بوو كە ئـەو وەختـە لـە حزورى مەجليسدا لـە ئەسـناى ئيعتـايى قـەراردا ئينتيقـادادى خۆيـان عـەرز بكردايـە، لاكين ئێستا ئيشو كارى هەيئـەت گەيشتۆتە ئـەم رادەيـە، لەبەر ئەمـە لـێرەدا ئيعـترازى بێجێيـە. وە عەلاوەتـەن وتـى لـەم مەسـئەلەيەوە ئيعـادەى بەحسـى عاقيبـەتى وەخيمە.

ئيجتماعى خيتامى هات بەتەقديم كردنى بەياناتێكى موفەسەڵ لە بابەت پرۆغرامـى هەيئەتـەوە. بۆ كەسبى ئيتلاع موعتەمـەدى سامى وەريگرتو وەعدى دا كـە بـە هـەموو وەسائيلى ئيشو كاريان ئاسان بكات. تـەحقيقات لـە موسڵ مۆقـەت ڕاوەستێنرا لـەپاش ئەوەى قەراريان دا كە لە ٢٥ شوباتدا لە كەركوك مولاقات بكەن بلاوبوونەوە.

بۆ تەحقيقاتى ئيترافى شار موسيو ئوفو يرسەن (ڕەئيس) لەگـەڵ جـەواد پاشـا و ميستـەر جاردين لە موسڵ مانەوە وە لەدێهاتى ئەو ناوە تا سنجارو تەلەعفەرو قەرەقوشو عەقرەى زيارەت كرد ئەو مەواقيعەى كە ئەچوون بە مەوجيبى ئەو دەفتەرەى كە معاونـەكان دابوويان وجوهى ديهاتە مجاورەكان بانگ ئەكرانو رايان وەرئەگيرا.

لەگـەڵ ڕوئەسـاى ئـەو قەبائيلـەى كـە لـە غـەربى ديجلـە سـاكينن مولاقـاتو ڕاى لێوەرگرتنى خسوسەن لە ڕەئيسى عەشيرەتى شەمەڕ كە موهيمە.

قونت تلەتى لە ئەربيلدا تا شەقلاوە و مەخمورو تەحقيقاتى ئيجرا كـرد نـازم بـەگ وە مۆزەفى ئينگليزى ميستـەر ليۆنو تـەرجومانى هەيئـەتى موسيوگرامەر (....) عەشـائيرى دروى[٣٦]، خۆشناو، كورە[٣٧]، شێخ بزێنىو دێهاتى سارليە گەڕاو مواجەهەى لەگەڵا كردن.

كۆلۆنيلى پۆليس لەمەنتيقەى كەركوكدا تا چەمچەماڵ تـەحقيقاتى كـرد سـەبيع بـەگ موخبيرى حكومـەتى عێراق، وە كـاميل بـەگ موخبيرى حكومـەتى توركيـاى لە ميعتـابوو لەگەڵ مومەسيلى عەشيرەتى العوبێد. جبور، داودە، هەمەوەندو وە شوان ملاقاتى كرد.

لە مەنتيقەى كفريدا موسيو بۆتارليس بە معاونەتى فەتاح بەگ زابتێكى ئينگليزى كە شـارەزاى ئـەو نـاوە بـوو ئيجـراى تـەحقيقاتى كـرد، ميسـيوپۆتارليس ئـەترافى جەبـەل حەمرين گەڕاو لەگەڵ عەشيرەتى جاف، زەنگەنە، دەلۆ، وەبەياد، مواجەهەو ملاقاتى كرد.

وە هەيئـەت لەگەڵ مومەسيلى عەشيرەتى مير يوسفىو بلباس، سورفى[٣٨] و هـەركى، خەيلانى و سائيرەدا ملاقاتى كرد.

ئەو ڕێيەو كە هەيئەت پيا ڕۆشتبوون لەخەريتەى يەكەمدا كە مولحـەقى ئـەم تـەقريرە بە بەيان كراوە.

ڕا وەرگرتنی عەشایەرو دێهاتەکان لەهی شارەکان زەحمەتر بوو چونکە ئەوان لەسیاسەتدا کەمتر بیَ مەعولمات وە لەئەمەدا زۆرتر دواکەوتوو بوون وە ئەوان لەم خسوسەوە مەعلوماتیان کەمتر بوو.

لە ئەسنایی تەحقیقاتدا موعامەلەی هەیئەت وەك و ژێرەوە بوو، ئەوەڵەن ئیعتباراتی ئاسان، وە لە حزوری ئەو کەسانە کەلایەنگرت بوونەوە لەئەسلی مەقسەد موباحەسەی جەرەیانی ئەکرد لەدوا. ئەیدا لەپاشەملەی موعاونەکان سوئال کرا هەیئەت لە تەحقیقاتدا تەنها ئسولێکی تەعقیب نەکرد لەم جیهەتەوە ریعایەتی ئیدراك و مەعریفەتی شاهیدەکانی کردووە.

لە دوایی‌دا ئەعزای هەیئەت لەگەڵ معاونەکان لە کەرکوك گردبوونەوە وە لەوێوە بۆ ئیکمالی تەحقیقات بۆ سلێمانی چوون لە ئەسنای گەڕانەوەیان لەسلێمانییەوە بۆ موسڵ، لە کەرکوك و ئاڵتون و کۆپری ، وە ئەربیل راوەستاون و تەحقیقاتیان ئیکمال ئەکرد کە بەعزیَ لە ئەعزاکان لەویَ موسیر نەبوبون بەتەواوکردنی.

هەیئەت لە ٨ی مارتدا گەڕایەوە موسڵ، لە حەرەکات وە وەزعیەتی پۆلیس زۆر مەمنوون بوون کە ئەعزای هەیئەتی تورکیا بەکەمالی حوریەت و سەربەستی ئەگەڕان و لەگەڵ بەخولق ئەبوون لە تەحقیقاتی دووەمدا حکومەتی مەحلیەی مەیدان هیچ بێجێیەکی نەدا. وە لەم مساعەدەیە معاونی تورکیا ئیستیفادەیان ئەکرد.

لەسەر هەیئەت تەسریح و بەیانی لازیمەی ئەو لائیحانەی کە حکومەتی بەریتانیا ئەینواند هەموو نەوعە مەعلوماتێکی تیا بوو (....) بەبیَ غەرەز ئەفکاری هەموو کیبارو ئەشرافی هەموو لایەکی تێدابوو بیَ ئەمەی تورك خواهەکان ئیستسنا بکرێن لە تەحقیقاتی دووەمدا هەیئەت لە موسڵ عیلمەن، دەوڵەمەندو فەقیر ی بەبیَ تەفریق ئیستجواب کرد وە تاقمیَ لەمەلاکان ساحێبی خانوو وە ساحێبی دێهات وە ئەرازی، وە هەموو مونتەخیبەی ئاینەکان کە ئیسمیان لە دەفاتری پێشووی تورکیادا موقەیەدن، وە هەموو ئەعزای مەجلیسی بەلەدییەی موسڵ هی بیست ساڵ لەمەوپێش تا حاڵی حازر بانکران و ئیستجوابی کردن.

هەیئەت کەزانی وەزیفەی تەحقیقات لە موسڵ تەواو بوو ڕووبە زاخۆ حەرەکەتی کرد. لەویَ لای دایە گەورە دێیەکانی مەسیحیەکانی مەنتیقەی قوش ودێهاتی یەزیدیەکانی مەنتیقەی باعەدریَ.

هەیئەت، لە زاخۆ لەگەڵ ڕوئەساوە ئەشرافی ئەو ناحیانەی کە کەوتونەتە ژورو خوارووی خەتی حدود کە لە برۆکسلدا ئیتفاقی لەسەر بەستراوە، بیلخاسە لەگەڵ مەسیحیەکانی ئەو دێهاتەنەی کە لە ئەرازی قەبائیلی گۆیان[٣٩] سندی واقیعە ملاقاتی کرد.

لەدوای ئەمە هەیئەت بۆ دەوامی تەحقیقاتی لە زاخۆوە بۆ دهۆك چوو. ئەهالی ئەویَ زۆر موتەهیج دی. داوا ئیجزارکردنی بەعزیَ شاهیدی بۆ ماڵەوە کرد کە لەخاریجی شار بۆ ئیقامەت چاکرابوون ئەو رۆژە قەرەباڵغەیەکی گەورە لەبەردەگا گردبووەوە. چونکە لەویَ شایعە وادرابوو کە سیلاحیەتی حوکم و ئیعتادی قەرار دراوەتە دەست هەیئەتی جەمعیەتی ئەقوام. لەسایەی تەدابیری شەدیدەی هەیئەت، وە لەسەر بەیان و ئیزاحاتی هەیئەتەوە مەملەکەت سکونەتی پێشووی وەرگرتووە.

هەیئەت لە دهۆکیش وەکو زاخۆ چە لە داخیلی شار وە چە لە ناحیەکان لەگەلٚ ئەو کەسانەی کە معاوناتی تورك و ئینگلیز ئیحزاریان تەلَەب کردبوو مولاقاتی کرد. هەیئەت ئەشرافی دهۆك، وە ئەو جەمعیەتانەی کە لەعەمادییە وە لەئەترافی شیمالەوە بۆ دهۆك دەعوەت کرابوون ئیستجوابی کردن.

موسەتەغنای بەیانەکە کە هەیئەت تەحقیقاتی حەسر نەکردبوو وە سەر ئاگاهدار بوو ئارەزووی ئەهالی لە نوقتەی سیاسەتەوە لە ئیلحاق کردنی مەملەکەتەکەیان بەیەکێك لەم دوو حکومەتە مونازع فیهی لە عەینی وەختدا لە حسابات و لە ئەحوالی رۆحیەی ئەهالی موباحیسەی ئەکرد.

هەیئەت لەگەلٚ جیٚ بیخسوسی موسلٚ، لەو تیجارەتخانەو بازاڕووە ئەنبارەکان کە چۆن زۆر ورد سەعی وە لە نوقتەی تیجارەت و ئیقتسادەوە گەلٚ سوئالی کردووە، وە لەئسنای سیاحەتیا دائیر بەعلومی جوغرافیاو ئەتنوغرافیاو فیزیۆلۆژی گەلٚ ملاحەزاتی دەستکەوتووە، وە دائیر بەوەسائیقی نەقلیە وەارداتی زراعیەو سائیرە راپۆرتی موختەسەری تەتزیم کردووە.

لەو دەشتانەی کە قابیلی سوکنایە وە لەمەواقیعی سائیرەدا بۆ ئیستحسالی مەعلومات لەخسوسی ئیشغالی عمومیەی ئەهالییەوە چەند سیاحەتێکی هەوائی ئیجراکرد، لەئەوەل سیاحەتدا بەسەر هەموو شاخەکانی سنجاردا، وسێ جار لە زاخۆ وە بۆ رواندز لەحدودی شیمال وەدووجاریش بەسەر جەبەل حەمریندا تەیرانی کردووە.

هەیئەت لە ١٨ مارتدا گەڕایەوە موسلٚ. چەند رۆژێکی لەوێ رابوارد. ئەم مسفەدەنە بەتەرتیب و رێکخستنی ئەو مەعلومات و وەسائیقەی کە گرد کرابۆوە خەریك بوو کە بەتەواوبوونی وەزیفەی تەحقیقات قەناعەت پەیدابوو بەڕێی تیجاری دێرزورو شام لە موسڵەوە حەرەکەتی کرد. وە لە ٢٠نیساندا کە مسادفی رۆژی دوو شەممەیە لەجنورەو ئیجتماع و دەست بە نووسینی ئەم تەقریرە کرا.

هەیئەت لێرەدا، لەو یارمەتیە بەقیمەتانەی موعەلیمی کولیەی (لەیید) موسیوگرامەر کە لەتەحریری ئەبوابی مەخسوسەی تورك و کوردو سارلیەدا نواندبووی، وە لەخەدەماتی کەبەسیفەتی موتەرجمێتی ئیبرازی کردبوو بەیانی تەشەکور ئەکا.

هەیئەت لەئەسنای وەزیفەدا لەزەواتی ئاتیەکە معاونەتی لیٚ تەلەب کردبوون ئیستفادەی کردووە:

لە کتێبخانەی مەجلیسی واشنتۆندا رەئیسی دائیرەی خەریتە کۆلۆنل. ل. ماریتن.
موعەلیمی کولیەی کۆلۆمبیا، لەنویورق[٤٠]، میستەر ل وستەرمان
موعەلیمی کولیەی هارود لەماشوزستە، میستەر ئا.ك کولیج
موعەلیمی کولیەی ویانە مسیو ئان. ئوبرە هەمەر
موستە شاری مۆزەخانەی تاریخی تەبیعی لەویانە دوقتور ویکتۆر
مدیری جەمعیەتی جوغرافیا لەئەمریکا پرۆفیسۆر ج. باومان
موعەلیمی کولیەی توبانچن مسیوش ئوهلیك
لەپاریس لەمەکتەبی وەتەندا موعەلمینی ئەلسنەی شەرقیە مسیوغۆر فوادامومبین
لەموعەلمینی کولیەی جنورە مسیو ئا. شبکسن
لەموعەلمینی کولیەی پاریس مسیو دیمانچون

لەموعەلمینی کولیەی بەرلین مسیو ئاد. شاسو
لەبەرلین پرۆفیسۆر موردمان
موعەلمی کولیەی بۆ داپشتە مسیو ئا. داوید
موعەلمی کولیەی بۆ داپشتە مسیو ج. نمس
مدیری قلوبی تجارەتو سناعەتی شەرقیە لەپاریس مسیو ز. خانزادیان
شێخ محەمەد عەلدو ئەلرەسول میسری (لە قاهیرە)
هەیئەت بەکەمالی خلوسەوە لەم زەواتی موحتەرەمەیە کە بەعیلمو عیرفانیان بۆ تەسهیلاتی ئیشو کارمان معاونەتیان فەرمووە بەیانی تەشەکورئەکا، وەلەم تەشەکورەدا ئیشتراکی جەمعیەتی ئەقوامیش ئومێد ئەکەین.

**قسمی دووەم**

**ملاحەزە لەسەر ئسلوبی تەحقیقات**

**کە هەر دوو حکومەتەکە ئیقتراحی کردبوو**

نیزاعێ کە هەیئەتی مەجبور کردبێ بەئەقری مەعلوماتو تەقدیم بەجەمعیەتی ئەقوام عائید بەئەسلێ مەسئەلە نەبووە وەلاکین شمولی هەیە بەسەر ئەو ئیختلافەی کە لەئارای تەرەفەنیدا نەشئەتی کردووە. لەخسوسی وەرگرتنی تەریقی لازمە بۆ حەلو فەسلی نیزاع.

لەئەسنای مفاوەزاتی مەجلیسی لۆزاندا حکومەتی تورکیا تەڵەبی ئیستفتای کرد. بەو فکرەوە کە ئەو ئسلوبە رێیەکی تەنهاو عادلە بۆ حەلی مەسئەلە. بۆ ئەمەی هەرچی مەعلوماتو موستەنەداتی لازمە هەیە گرد بکرێتەوە حکومەتی بەریتانیا مەیلی تەشکیل کردنی هەیئەتێکی کرد. وەختێ کە جەمعیەتی ئەقوام بەتەعیینی هەیئەتی تەحقیقیە قەراریدا، لەگەڵ ئەمەی ئسولی ئیستشارەی ئەفکاری ئەهالیشی بە باش بینی، مەرەخەسی تورکیا ئسلوبی موقتەرەحەی قبوڵکرد. وە بۆ ئیزهاری ئارەزووی حکومەتەکەی بەخسوسی ئەسراری کرد کە ئەو هەیئەتەی بۆ مەنتیقەی موتەنازع فیهی ئەنێررێ لەپێش هەموو شتێکدا تەماشای ئەو دوو ئسولە بەیان کراوەیە بکا. وە بۆ کەشفی ئارای سیاسیەی حەقیقیەی ئەهالی موسڵ بەچاکترین ئسول دابنرێ.

جەمعیەتی ئەقوام تەوسیەی هەیئەتیکرد بەنەزەری ئیعتبار تەماشای ئارای تەرەفەین بکا کەموختەسە (بەو ئسلوبەو تەریقەی کەوەرگرتنی لازمە، وە لەپێش دەست بە بەحسکردن لەئمورێ کە موتەعەلیق مەوزوعی دەعوای ئەسلی بێ، لازم بینرا کە لەم خسوسەوە بەستی مەقال بکرێ.

بەیانو تەقدیم کردنی خولاسەی نەتائیجی مودعیاتی هەر دوو حکومەتەکە بەفائیدە بینرا.

١-خولاسەی دەلائیل وە بەراهینی حکومەتی تورکیا:

مەسئەلەیی، کە ئەوەندە میهم بێ وەموقەدەراتی میقدارێکی گەورەی ئەهالی تێدابێ، لایق نییە بخرێتە تەحکیمەوە. شوبهە نییە هەیئەت ئەتوانێ کەبە کەشفی بەعزێ حەقائیق بگا. وەلاکین ئەو قەرارەی کە لەبابەت ئارەزووی ئەهالیەوە ئەینوێنێ لەتەرەدودو شوبهە لێ کردن خاڵی نییە، چونکە هەیئەت لەتاقمێکی مەحدود زیاتر مواجەهە

لەگەڵ خەڵقدا ناکات کە ئەوانیش لەڕای عمومیدا قسمێکی بچووك تەمسیل ئەکەن، جابەم ئەحواڵە ئارەزووی حەقیقیەی ئەهالی بەقەتعی مەعلوم نابێ، ئەو وەختە تەحقیقاتیان بەنەقوسانی ئەمێنێتەوە وە ئەبێتە باعیسی نەتیجەی دەستکەوتێ کەمەناخی و مەغایری عەدل و حەقانیەت بێ. وەختێ کە حەل و فەسڵی نیزاع تەئسیری بەسەر مەسالیحی سەد هەزار کەسی ئەفرادی ئەهالیدا بێ، ئینساف، وەئەفکاری سیاسیە ئیقتزا بەتەسهیلکردنی مەسلەحەتی ئەهالی ئەکا، بۆ ئەمەی کەبتوانێ لەبابەت موقەدەراتیانی وە بەکەمالی حوریەت و سەربەستی قەرارو ڕای خۆیان بدەن. چونکە نەقلی میلەتێ لە حکومەتێکەوە بۆ حکومەتێکی تر بەبێ ڕەزامەندنیان جائیز نییە.

بۆ حوکمی قەتعی لەموقەدەراتی مەنتیقەیێ کە لەژێر نیزاعدا بێ، وەکو ئیمسالی ئەم قەزیەیە ئیعتراف بەلزومیەتی ئسولی ئیستفتا کراوە، هەموو مەسائیلی سلیزبای شیمالی، وە بەعزێ لە ئەقسام و پروسیای شەرقی، وە مەنتیقەی شلبزویك وەکلاکفورت وەسائیرە بەم نەوعەبووە، مەلەلی شەرقیە دەرك و فەرقی ئەو ئەسبە ئەکا کە بۆتە باعیسی مەعامەکردنە لەگەڵیا بەنەوعێ زدی ئەو قاعیدەو تەریقە کە بۆ مەعامەکردنە دەرحەق بەئەقوامی ئەوروپا ئیتفاقی لەسەر بەستراوە.

وە ئەگەر لەمەسئەلەی ئینتخابی ئەمیر فەیسەڵدا ئیستشارەی ڕای ئەهالی عیراق مومکین بووبێ، کەوابوو مەعزورین لەتەسدیق نەکردنی ئەو قەولە کەوترابوو بۆ خسوسی ئیلحاقیان بەیەکێ لەم دوو حکومەتە لەئیستیشارەو ڕای وەرگرتنیاندا مەوانیعی قەویە مەوجودە. کە ئەم جیهەتە لەمەسئەلەی ئینتخابی ئەمیر بۆ ئەوان مهیم ترە.

ئەگەر حکومەتی بەریتانیا ڕەفزی ئیستفتا بکا لەزوعفی بەراهینی، وە لەبێ حەقی داواکەی وە بۆ تەرجیح کردنی میللەتی تورك دەلیلە.

لێرەدا مادەیەکی تر بۆ لزومیەت بەئیجرای ئیستفتا لەویلایەتی موسڵدا کە ئەویش ئەم نقوسانیەتە بەدیهی یە لەوەسائیق و بەیاناتی بەریتانیا لەو دوو دەفعە ئیستشارەی عومومییەی ساڵی ١٩١٩ وەساڵی ١٩٢١ کە لەعیراقدا ئیجرای کردبوو.. (موافقی موزەکەرەی تورکیا، لەئەیلوبی ١٩٢٤س ٤٩٤-١٩٢٤-٠٧).

أ-لۆردگورزن، متالەعەنامەی عیسمەت پاشا کە لەکانونی ساڵی ١٩٢٣ لەلۆزاندا دەریان کردبوو ڕەدکردەوە کە ئەولەوی لیئەمری بەریتانیا لەخسوسی بەیەکەوە مانەوەیان وەیا لەیەك جوێ بوونەوەیان ئیستشارەی ڕای ئەهالی موسڵ، بەغداد، وەبەسرەی کرد. ئەهالی ئەم سێ ویلایەتە جەوابەن جوزئی لا یەنفە کە بۆ نیاتی بەیان، وە لەیەك جوێ بوونەوەیان ڕەدکرد. وە لەعەینی وەختدا بۆ ئیعتای قەراریان لەخسوسی ئینتخابی مەلیکێکی عەرەب لێیان پرسرا، جەوابیان بەتەواوی یەك نەبوو. فەقەت وەختێ کە لەساڵی ١٩٢١دا ئیستشارەی عومومی ئیجراکرا، لەبابەت ئینتخابکردنی ئەمیر فەیسەڵ بۆ مەلیکی عیراق، ئەهالی ویلایەتی موسڵ بەئیتفاقی ئارا بەمەلیکی قبوڵ و ئینتخابیان کردووە.

ب-هەر لەو بەیاناتەدا لۆردگورزن بەحسی ئەو تورکانەی کرد کە لەقسمێکی ویلایەتدا ساکیتن وە وتویەتی: بێجگە لەخەڵقی کەرکوك عومومی ئەهالی بە ئیتفاقی ئارا بەعیراق ئیلتحاقیان قەرار وە ئەمیر فەیسەڵیان بەمەلیك قبوڵ کردووە. (موزەکەراتی لۆزان جلد -١- سەحیفە ٢٩٢)[٤١].

## له مهجلیسی لۆزاندا مهسئلهی موسڵ

لهمهجلیسی لۆزاندا ئهو مهسائیلهی لهبهینی ئینگلیزو تورکیادا مهوجود بوو به موافهقهتی تهرهفهین وه بهموافهقهتێکی عهزیمی تورك حهل و فهسڵکراوه.

مهسئهلهی موسڵ وهحدودی عیراق لهپاش ئینقازی مهوادی موعاهدهده به ٩مانگ لهبهینی ههردوو حکومهتا حهل دهکرێ وهکو لهمهتبوعاتی ئهجنهبیدا موتالهعهکراوه وامهعلوم ئهبێ کهسهبهبی موخالهفهت لهسهر نهفسی شاری موسڵه که عهرهب ئیدیعای ئهکات وهئهو ئهرازییه که بهکورد مهسکونهو ئهکسهریهتی عهرهب نیه که لهبهینی تورك و ئینگلیزدا موجیبی نیزاعه، وهبیلخاسه مهسئهلهی نهوتی موسڵ که تورك ئیدیعای حیسهیهکی ئهکات وهها مهعلوم ئهکات که حکومهتهین ههتا ئێستا لهم جیههتانهوه فکرو قهراری قهتعیان نهدابێ فهقهت رێککهوتیان زیاتر مهئموله.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ (٣)، ل (٣)

## میعادی موزاکهره دهرحهق بهموسڵ

نهزهر بهتهلهغرافێك که جهریدهی ئهلبهلاغ بهسورهتی خسوسییه لهئهستانبۆڵ وهریگرتووه تۆفیق بهگ میر ئالای بووه بهرهئیسی جهمعیهتی ئهو تورکانهی که مهئمورن بۆ موزاکهرهی موسڵ، لهپاش حازر بوونی ههیئهتی ئینگلیز له ٢٥ی تشرینی ئهوهلدا موزاکهره دهست پێدهکا.

ئومێدی ئیستیقلال/ ژماره (٦)، ل (٣)

## له غهزهتهی ئهلئهمهل

## موسڵ کلیلی شهرقی ئهوسهته

(غهزهتهی لازی فرانسز) که لهپاریسدا ئینتشار ئهکا نوسیویهتی ویلایهتی موسڵ چونکه واقیع بووه لهسهر نههری دیجله وسیلسیلهی چیای کوردستان، بهرهن و نههرهن به بهغدا هیند، ئیرانی کورد تا ئهنادۆڵ و بهسوریه مهربوتهو بهواسیتهیهوه بۆته کلیلی شهرقی ئهوسهت. تهملوکهیهکی عهسکهری که مومکینه تههدیدی بیلادی عیراق بکا لهو شاخانهوه زهور ئهکا، که ئیمتدادی ئهو شاخانه لهسهر شکلی نیسف دائیرهیهکه لهشیمال و شهرقی سهحرای ویلایهتی موسڵه. لهنوقتهی عهسکهریشهوه موسڵ نوقتهیهکی مقاوهمهی مهرکهزییه چونکه ههدهفی یهکانهی نهزهری موهاجمین بۆ سهر شاری بهغدا تهشکیل ئهکا. لهحهربی عمومی (١٩١٥-١٩١٦) میلادیدا تورکیاو روس و ئینگلیز مهقسهدی یهکانهیان ئهمه بوو که به واستهی ئهو ٣سیلسیلهی جیبالهی له شیمال و شهرقی موسڵ واقیعن ئهم ویلایهته لهجهبههی قهفقاس و توران جیابکهنهوه.

بەواستەی ئیتسالی ئەم ویلایەتە بەعەجەمو کوردستانەوە، وەبەواستەی دوو ڕێگای موهیم کە عەرەبانەی نەقلیەیەی پیائەڕوا، وەکو دەربەندی (قوتر) لەتەریقی وانو تەبریزو ڕێگای (زاگروس) لەڕێگای هەمەدانو بەغدایە. دیسان ئەم ویلایەتە لەنوقاتی موهیمەی ئسەوقی ئەلجەیشی مەعدودە. فیلواقیع لەم شاخە بەرزانەدا گەلێ ڕێگای سەختی تر هەیە کە کاروانو هێستری پیا ئەڕوا فەقەت لەمەمەڕی ڕەواندزو شنۆ بەولاوە لەهیچ ڕێگایەکیدا عەرەبی پیا ناڕوا لەبەر ئەمە ئۆردوی روسو تورك هەر لەم ڕێگایەوە هجومیان بۆ یەکتر ئەکرد.

موتەخەسسین ئەگەر تەماشای خەریتەی ئەم مەوقیعە بکەن ئەبینن کە هەر کەسێك ئارەزووی وەبتکردنی عیراقو هندستان بکا بە هەرحاڵ ئەبێ ئێرانو کوردستان بکا بە ئوسلحوەکانی خۆی. بۆ ئەمەیش شاری موسڵ لەپێش هەموو شتێکدا نەزەری دیقەتی ریجالی عەسکەریە جەلب ئەکا، لەبەر ئەمە بۆ محافەزەی شارەکانی عیراق لەقیوای هەوائیەو ناریەی دژمن، موسڵ یەکانە مەرکەزی هجومو مودافەعەیە وەزاتەن لەحەربی عومومیشدا ئەترافی موسڵ بوو بوو بەسەبەبی موراقەبەو هجومی شەدیدی ئۆردوی روسو تورك، چونکە ئەم جێگایە لەبەینی ئێران و کوردستان و مەمالیکی شیمالیەی سائیرەدا مەوقیعێکی موهیم بووە.

کە وەقتێکی تورك لەئێران وە لەکوردستاندا تەقەدومی کرد و گەیشتبووە ساوحیلاق روسەکان بۆ حیمایەی مەناتیقی دۆستەکانی خۆیان وەحیمایەی تەبریز، ئورمیەو چولفە، وەئازەربایجان لە مەواقیعی موهیمەدا مقاومەت و تەعەروزی قوەتی ساوحیلاقی تورکیان ئەکرد کە ئەم مەوقیعانەش عیبارەت بوو لەختوتی تەقەروبیەی ویلایەتی موسڵ.

حکومەتێك ئەگەر ویلایەتی موسڵی بەدەستەوە بێ و خسوسەن ئۆردویەکی مونتەزەم و موجەهەزی ببێ و بە پارەی خۆی ڕێگای شەمەندوفێری بۆ بکا عومومی شەرقی وەستا ئەگرێتە ژێر دەستی خۆی.

هەر لەبەر ئەم نوقتە موهیمە چەند دەوڵەتێك بەقەراری (سان ریمۆ) قەراریاندا کەویلایەتی موسڵ نابێ لەعیراق جیاببێتەوە، ئەگەر چی دراوسیەکانی شیمالیەمان ویستیان نفوزو ناوی سایقیان لە موسڵماندا تیکرار ئیعادە بکەنەوە بەحەسەبی ئەوەی کە (٦٠٠) ساڵە حاکمی بوون بۆ ئەوەیە کە ئینگلیز لە هیندستان داو فەرەنسایش لە سوریەدا تەهدید بکەن، وەلەشارەکانی قەفقاس وتارەوە عەجەمدا تەئسیسی نفوزیان بۆ مومکین بێ زاتەن رونیش بۆ ئەوە کەتەئسیر لەهیندستان بکا دیسان هەر ئارەزووی موسڵی ئەکرد ئەم دراوسیەیشمان هەر ئەیویست کە بەواستەی ئمتیازی (نەوتەکە)وە مونازەعەیەکی گەورە بخاتە بەینی حکوماتی غەربیە فەقەت چونکە حەقو حەقیقەت، ئەم مەتالیبە ناحەقەی خستە مەیدانی عەدلو ئینسافەوە بۆ حکومەتی(...) نیهایەت مەعلوم بوو کە ئەم حەقە بۆ عیراقیەکان مەسەلەیەکی حەیاتیو سیاسییە، ئێمەش وادەزانین کە حەسەبی جنسیەتو سیاسیەتو عەسکەری وەئیقتسادیاتیوە شاری موسڵ ئیلا ماشائەڵڵا بووە بە جوزئێکی لا یەنفەکی عیراق.

ئەلئەمەل- موسڵ

ئومێدی ئیستیقلال، ژ(١٠)، ل(٣)

## مشكيلەی موسڵ
## لە بەینی تورك و ئینگلیزدا

لە غەزەتەی ئەلئەمەل

موخبیری غەزەتەی ئەلمەقەتەم لە ئەستامبوڵەوە ئەخباری كردووە كە ئەنزار متەوەجیهە بەحەلكردنی مەسئەلەی موسڵ. كەحەل و فەسڵی ئەم مەسئەلەیە موتەعەلیق بووە بەخیتامی سوڵحی ئینگلیزو تورك. دكتۆر عەدنان بەگ بۆ ئەم خسوسە موراجەعەتی بەسەفارەتی ئینگلیز كردووە لەبەر ئەمە لەنسغی ئەوەڵی مانگی (ئۆكتۆبەردا) هەیئەتێك دائەمەزرێ. بۆ ئەم هەیئەتی هێشتا جێگای موزاكەرە تەعیین نەكراوە، چونكە ئەبێ جێگایەكی وا ئینتخاب بكرێ كە بۆ موخابەرات و تەعلیمات وەقت و زەمان زایع نەكرێ، ئەمەیش رەنگە ئەستانبوڵ بێ.

وەها مەئمول ئەكرێ كە زوڵفی بەگی نائیبی دیاربەكرو سابق ئەعزای مەجلسی لۆزان لەگەڵ قائمقام تۆفیق بەگی موستە شاری عەسكەری هەیئەتی مەرەخەسەی تورك و لەوەزارەتی خارجیەی حكومەتی ئینگلیز مدیری شئونی شەرقیە مستەركرابن جستون تەمسیلی حكومەتی ئینگلیز بكات چونكە ئەمانە لەئەسنای سوڵحی لۆزاندا پێكهاتبوون ئەربابی موتالەعە ئەیبینن كە پێكهاتنی ئەم دوو حكومەتە لەدەرەجەی ئیمكاندابێ.

چونكە وەكو جەنەراڵ تاونسهەند گوتویەتی نەئینگلیز بۆ موسڵ لەگەڵ تورك و نەتوركیش لەسەر موسڵ حەرەب لەگەڵ ئینگلیز ئەكا.

چونكە بۆ هەردووكیان وەبیلخاسە بۆ تورك دوو ئیسلاح و تەعمیرەی ئەم خسوسە لەهەموو شەڕو شۆڕێك چاكترە وە هەر دوولا بەمە موحتاجە.

بەعزێك دەلائیلیش هەیە دیسان حسن نیەتی ئەم دوو حكومەتە تەئیید دەكا وەكو كەمكردنەوەی یەعنی تەسبیكردنی مەوجودی حازری ئۆردوی تورك وەنەقلكردنی مەركەزی قۆڵی ئۆردوی دیاربەكر بۆ سیواس كە قوماندانەكەی جەواد پاشایە ئەگەر ئیتفاقیان لەسەر مەوادی ئبتدائیەیان نەكردایە ئەمانە نەئەبوو. ئەیزەن- مەوجودیەتی جەنەراڵ تاونسهەندوە جەنەراڵ هارینگتۆن و جەنەراڵ عیسمەت پاشا تەبشیری حالكردن بەسهولەتی ئەكا. بۆ موناسەیاتی حەسەنەی تورك و ئینگلیز، سێهەم دەلیلیش ئەمەیە كە حكومەتی ئینگلیز بە بێ پرس لەپارلمنتۆی خۆی تەبلیغی وەزارەتی خارجیەی توركی كرد كە موباشیرەت بەتەعیینی قونسلوسی خۆی لەتوركیا ئەكاو دیسان تەبلیغی كرد كە ئەموالی تورك لەمەولا حجز ناكرێ و ئەمریدا بە رەعیەتی ئینگلیز كە دیوناتی رەعیەتی تورك تەئدیە بكەنەوە.. ئیلەخ.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ (١١)، ل (٢)

خەبەرێکی ئەخیر

موزاکەرەی موسڵ لەئەنقەرە ئەکرێ

غەزەتەی نەجمە ئەڵێ بەغداد تایمس ئیقتباسی لەغەزەتەی توحیدی ئەفکار نووسیویەتی، کە ئیحتمالی قەوی وایە کە بۆ ئەمەی کە وەقت زایع نەبێ موزاکەرەی موسڵ ئەنقەرە بکرێ

مەرەخەسی بەریتانیا (مستەر کرابن جۆن سۆن)ە مەرەخسی تورکیش زولفی بەگ مەبعوسی دیاربەکرە بەسیفەتی مشاوری تۆفیق بەگ قائمقامی عەسکەریشی لەگەڵ ئەبێ.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ(١٤)، ل(٤)

## موسڵ

موسڵ– لەپاش گەیشتنی یوسف کەمال مومەسیلی تورکیا کەچووە بۆ لۆندەرە تەعلیمات بەمەشار ئیلەهی دراوە کە مەسەلەی موسڵ ئەو بەخشەیە بە ٩مانگ لەپاش تەخەلیەی ئەستەمۆڵ لەقیوای موتەفیقین.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ (١٧)، ل(٢)

لوندرە– غەزەتە ئەنووسێ ئیحتمالە مەسەلەی موزاکەرەی موسڵ لەئەستامبۆڵ حەل بکرێ.

نەجمە

ئومێدی ئیستیقلال، ژ(١٧)، ل(٣)

بۆ مەسئەلەی موسڵ مەرەخەسەکانی تورکیا

ئەنقەرە– حکومەتی تورکیا ئەو مەرەخەسانەی کە بۆ موزاکەرەی مەسئەلەی موسڵ تەعین بوون ئەساسیان بەلۆندرە دراوە.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ (١٨)، ل(٢)

## موزاکەرەی موسڵ

موزاکەرەی موسڵ لەئەستانبۆڵ جەرەیان ئەکا (سەرپرسی کوکس) مومەسیلی حکومەتی بەریتانیایە.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ (١٨)، ل (٢)

## موزاکەرەی موسڵ

هەر چەندە بۆ موزاکەرەی موسڵ وەقت تەعین نەکراوە فەقەت مەحەلی موزاکەرە بەسورەتی قەتعی ئەستانبوڵ دەبێت.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ (١٩)، ل(٣)

لەغەزەتەی ئەلعیراقەوە:

ئاژانسی رۆیتەر

موسڵ لەئەنقەرەدا

ئەستامبوڵ- لەمەجلیسی وەتەنی ئەنقەرەدا دەرحەق بەئەحوالی خارجیە مناقەشەیەکی بەشدەت کراوە. وە لەو ئیجتماعەدا کە لەهەفتەی پێشوودا عەقدکرابوو قسمێکی زۆر لەمەبجوسانی تورك بۆ ئیجرای ئەم مناقەشەیە لەسەر ئەو کردەوانەی حکومەتی بەریتانیا لەویلایەتی موسڵ ئیلحاح و ئیسراریان کرد لەحکومەت بەبێ مسامەحە تەلەبی ویلایەتی موسڵ بکەن، هەتا شاخان حەمەنیش کەقەشەیە ئیستیلای بەسەردا بکرێ.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ(٢١)، ل(٢)

لەغەزەتەی نەجمەوە

لەنەزەری (مستەر فیشەر)دا مەعاهەدە نامەی لۆزان

مەسئەلەی تورکیاو موسڵ

لوندرە- ١ی نیسان ٣٤٠- ئەمڕۆ لەمەجلیسی عەوامدا دائیر بەمەعاهەدەی لۆزان کەمناقەشە جەرەیانی ئەکرد (مستەر فیشە) نەتقی وای داوە: ئەم مەعاهەدە نامەیە شەرەفی حکومەتی بەریتانیای مخەل وەبۆ مەسلەحەتی غەیرە مەوافیقە، چونکە بەریتانیا بەهەموو مەوجودیەتی خۆی بۆ حیمایەو مەدافیعێ کەسەرفی کرد مەنافیعی بۆ حکومەتی تورکیا تەرك کردووە، بەئاچوغی بەتورکەکان بگوترایە کە لەتورکیادا کەساکینن لەگەڵ مەسیحیەکان بۆ حیمایەی تیجارەتی حکومەتی بەریتانیا تەعدیلاتێکی بە ئەساسە کە ئەم مەعاهەدە نامەیە ئەتوانێت داخیل بکەن بەتەشکیلی حکومەتێکی بەقوەت بۆ تورك معاونەت دەکەین. لە ئاخردا سەفارەت لەئەستانبۆلەوە نەقلی بۆ ئەنقەرە لەحکومەت تەڵەبی کردووە.

لەپاش ئەمە (سەرکریك) ئەمریکاو بەریتانیا لەداخیلی تورکیا لەو مەنافیعەکە ئیستحسالی کردووە بەحسی کردووە حکومەتی ئەمریکا وەکو بەریتانیا بۆ تورکەکان هیچ تەعەهودات وە ئیمتیازاتێکی نەدراوە، لەداخیلی تورکیا بە عەینی مەنافیع مونتەفیع نەبێ و ئیمتیازاتێ کە بەتورکەکان دراوە هەزار هەزار باشتر بوو کە بدرایە بەفەرانسە چونکە فەرانسە لەوەقتی حەربدا موتەفیقمان بوو لاکین تورکیا لەوەقێ حەربدا دوشمن بوو.

(مستەر راهسەی ماکدونالد) لەجەوابی هەردوو نوقتەکاندا وا جەوابی داوەتەوە: ئەم موعاهەدە نامەیە بەنسبەت ئیجابی وەقت عیبارەتە لەوەسیقەیەکی رەسمیە.

ئەگەر نایبی موحافزین لەزەمانی خۆیدا عائید بەمە بەفکری منیان بکردایە غەیری ئەمە هیچی ترم نەئەکرت، ئەگەر حکومەتی بەریتانیا ئەمە رووکەشیە کە لەپێش تەسدیقی ئێمەوە حکومەت سائیرە تەسدیقی بکات موحەقیقی ئێمە بەعناد چی ئەزانن ئیتر لەبەر ئەسبابی ئاتیە تەسدیقی زەروریە. تەئخیری تەسدیقی تورکەکان ئەخاتە وەسوەسەو تەفکیرەوە لەناو دەوڵەتانی ئەوروپا دەرەجەی حکومەتان بۆ خاتری کەبناسرێ ئەسراریان کردووە. لەبەر ئەمە بۆ موزاکەرەی حدودی عیراق هەیئەت تەعین نەکراوە، حکومەتی بەریتانیا بەتەعین کردنی دوو شەخس لەتورکیا هەر چەندی سەعی کردووە تورکیا گوتویەتی هەتا مەعاهەدەنامە تەسدیق نەکرێ تەعین ناکرێ تورکەکان لەم حەرەکاتی سیاسیە کە ئیزهاریان کردووە شوبهە نییە کە ئەنقەرە ئەکەن بەپایتەخت. چونکە لەحاڵی حازردا بەواستەی ئەستانبۆڵەوە تەئمینی عیلاقە ئەتوانن بکەن.

ئومێد ئیستیقلال، ژ (۲۳)، ل (۳)

## موزاکەرەی موسڵ چ وەقت دەست پێ دەکا

مستەر رامسەی ماکدۆنالد بۆ تەسدیقی مەعاهەدە نامەی لۆزان مناقەشەی کردووە

لوندرە ۱٥- تورکیا بۆ تەسدیقی لایحەی مەعاهەدەی لۆزان قاپی مناقەشە ئەمڕۆ مستەر رامسەی ماکدونالد لەمەجلیسی عەوامدا بەم نەوعە فکری بەیانکردووە.

لەبەر ئەوەی کەمەعاهەدەی لۆزان تەسدیق نەکراوە وەهیچ شتێك وقوعی نەبووە لەحەقی مەسئەلەی موسڵ قسەیەکم نیە (فەقەت سەر پرسی کوکس) گوتوویەتی لەپاش تەسدیقی مەعاهەدە نامەی لۆزان دەرحاڵ ئومێد ئەکەم دەست بەم موزاکەرەی موسڵە بکرێ. لەمەجلیسی میلەتی ئەنقەرەدا هەتا مناقەشەی موسڵ دەوام بکات موزاکەرەی موسڵ دووجاری سعوبەت دەبێ. وە لەم خسوسەوە موخاتەرەی زیاتر دەبێ و بۆ نیهایەت وەتەمام بوونی ئەم مناقەشەیە زۆر ئارەزووم هەیە.

لەعەینی تاریخدا بەگوێرەی تەلەغرافێك کە لەلۆندرەوە. هاتووە بۆ تەسدیقی لایحەی مەعاهەدەنامەی لۆزان لەمەجلیسی مەبعوساندا مناقەشە جەرەیانی کردووە وەبەئەکسەرەیەت ئاراو بەسورەتی قەتعیە مەوافیقەتیان بەم لایحەیە کردووە، (مستەر کریك) دائیر بەلائیحە کە دابووی فکری لەنیهایەتدا وەرگرتووە.

(مستەر بالدوین) مەعاهەدە نامەی لۆزانی بەم نەوعە مودافەعە کردووە. بۆ ئیمزاکردنی مەعاهەدە نامەی هەردوو تەرەفی موحاریب لەو رۆژەی کەسیلاحیان داناوە ئەو وەزعیەتەی کە.. مابۆوە ئەو وەزعیەتە مەعاهەدە نامەیەکی موناسیب بووە. ئەو مولکانەی مەنسوب بۆ حکومەتێ کە لەم خسوسەوە موتەفەق نەبوونیان بەخاتری کەسانە هاتبوو (مستەر رامسەری ماکدونا لدیش) دەڵێ دائیر بەرەسمیەتی موستەعمەرەکان بەمەقابیلی مەعاهەدە نامە بەم سورەتە تەسریحات ئەدا، کە مەعاهەدەی سەرەوە لەگەڵ مەعاهەدەیەکی کە لەبەینی بولغارستان، ئاوبستریا، مەجارستاندا بەستراوە لەوەقتی

تەنزیمی مەوادی مەعاهەدە دامەرەخەسی هیچ موستەعمەرەیەك وامەعلوم بووە حازرنیە ئیمپراتۆریەتێ لەتەرەفی خۆیەوە بەئەسالەت وەبەناوی موستەعمەرەکانەوە بەوەکالەت ئیمزای کردووە، حکومەتی.. .. هەیە کە قەراری مەعاهەدە نامەی لۆزان قبول بکا، موستەعمەراتی سائیرەیش لەم خسوسەوە کەرەئیان ئیستیفسارکراوە وەها مەعلوم بووە کە تەرەفدار تەسدیق مەعاهەدە نامەن.

ئومێدی ئیستیقلال، ژ(٢٤)، ل(١)

## مەسئلەی موسڵ

بۆ موزاکەرەی موسڵ لە ٣مایسدا لەئەستامبۆل عەقدو سەرپرسی کوکس مومەسیلی بەریتانیاو بەپێی خەبەری مەوسوق تەها ئەفەندی هاشمی بەمەرەخەسی عیراق تەعینکراوە شایعەی بیستووە.

موفەتیشی ئیداری کەرکوك مێجەر ئەدمۆنس بە وەعدی شەش مانگ. مەئزونیەت چۆتەوە بۆ لۆندرە

ئومێدی ئیستیقلال، ١ (٢٥)، ل (١)

لەغەزەتەی نەجمەوە:

تەسدیقی مەعاهەدە نامەی لۆزان

مەعاهەدەنامەی لۆزان لەپاش تەسدیقی لەمەجلیسی عەوام وەلۆردەکاندا لەتەرەفی قەراریشەوە تەسدیق کراوە.

ئومێدی ئیستیقلال[42] ژ(٢٥)، ل (١)

شەرق لەغەزەتەکانی عەرەبدا

حدودی شیمالیەی عیراق

ئەستەمبۆڵ ٩ تەمموز، لەموزەکەرەیەکدا کە میستەر هەندرسن (مەئموری ئموری سەفارەتی بەریتانیا) لە رۆژی (٢١تەموز) داویەتی بە جێنشینی دوکتۆر عەدنان بەگ مەندوبی وەزارەتی خارجیەی ئەنقەرە، وا بەیان کراوە، کە حکومەتی بەریتانیا خەریکی ئیحزاراتە بۆ ئەوەی کە مەسئەلەی موسڵەوە حدودی عیراق تەقدیم بکا بەجەمعیەتی ئومەمو مومکینی نابێ ئەم ئیحزاراتە پەك بخا، فەقەت هەر چۆنێ بێ بەریتانیا هیچ ئیقتراحات وە فکرێ کە حکومەتی تورك بۆ برانەوەی مەسئەلەی حدود تەقدیمی عەسبەتی ئەلئومەمی بکا قبوڵی ئەکا وەفەقەت ئەبێ تورك زوو بەزوویی قەراری خۆی بدات.

ژیانەوە، ژ(٢)، ل (٢)

لەئەلعیراقەوە

مەسئەلەی موسڵ لەعوسبەت ئەلئومەم دا

لونـدرە ١٢ ئاغســتوس- خەبـەرێك كـە لـەجنوەوە، هـاتووە كـە حكومـەتی بـەریتانیا. تەلـەبی لەعوسـبەتی ئەلئومـەم كـردووە كـە مەسـئەلەی موسـڵ داخیلـی پرۆگرامی ئەو جەلسـەی مەجلیسە بكا كە بەپێی مەعاهەدەی لۆزان لە ٢٩ ئاغستوسدا عەقد ئەكرێ.

ژیانەوە، ژ (٢)، ل (٣)

جنوە ٢ ئەیلول:

زەكـائی بـەگ كـە مومەسـیلی توركـە لۆنـدرە، منیـف بـەگ كـە سـكرتێری عمومـی وەزارەتی خارجیەی توركە (وەهەر دووكیان ئەعزا بوون لەج ەمعیەتی لۆزاندا) مەسئەلەی موسڵ تەقدیمی عوسبەتی ئەلئومەم ئەكەن.

ژیانەوە، ژ (٣١)، ل(٣)

لە ئەلعالەم ئەلعەرەبیەوە:

قەراری مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم

لەبابەت حدودی موسڵەوە

بروكسیل ٢٩ تشرینی ئەوەل: ئەو مەنتقەیـەی كە داخیلـی قـەراری ئاتی مەجلیسـی عوسبەتی ئەلئومەمە لەبابەت حاڵی حازری حـدودی توركو عیراقـەوە بـە درێژایـی دوانـزە میلو بەپانایی سێ میل، وە هەر دوولا (ئینگلیزو تورك) لازمە هەموو لایەكی ئەو ئەرازیـە كـە لـە ١٥ تشرینی سـانیدا تـەعین كـراوە تەخەلیـەی بكـەن قومسیۆنی حـدود بەسـورەتی خسوسیە تەبلیغی ئەكا كە ئەم خەتە متەوەقیفە هەتا مومكین بێ تا ئاخر قەرار ئەمێنێ. وە هەتا قەراری نیهایەتی تەملیكی ویلایەتی موسڵ دراوە بەحكومەتی بـەریتانیا. وە لـەو لایشەوە تورك ئەبێ چەند ئاواییەك تەخەلیە بكا، هەر دوولا چەند ئاواییێكیان لەسەرە، وە هیچ قەتعە ئەرازیەكی تیانییە كە ئەهمیەتی حەربیەی بێ.

ژیانەوە، ژ(٩)، ل (٢)

لەمەنبەعێكی مەوسوقەوە:

خەبەر زانراوە كە لەسەر قەراری عوسبەتی ئەلئومەم توركەكان هەر تەحشیداتێك كە لەنزیك حدودی ویلایەتی موسڵ كردبوویان لایان بردو حدودەكەیان چۆڵ كرد.

ژیانەوە، ژ(٩)، ل(٢)

له (ئەلعیراقەوە):

مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم بۆ تەدقیقی ئیش و کاری حدودی بەینی عیراق و تورك چوار سکرتێر ئەنێرێ کە ئەکسەریان ئەهلی ئەسوبچەرە و ئیتالیان.

ژیانەوە، ژ (١٣)، ل (٣)

**تەشکیلی مەجلیسی وەتەنی لەموسڵ**

**لەغەزەتەی (ئەلعەهدەوە) کە لەموسڵ دەردەچێ**

ڕۆژی دوو شەممە موسادیفی، ٢٦ی کانونی ساڵی ١٩٢٥ لەسەعات پێنجی ڕۆژدا عمومی ئەشراف و عولەماو وەتەنیەکانی موسڵ لەدائیرەی بەلەدیە گردبوونەوە وەلە تەرەفی ئاسف ئەفەندیەوە خوتبەیەکی موئەسیرو بەلیغ خوێندرایەوە لەبۆ موحافەزەی حدودی حازرەی ویلایەتی موسڵ هەرچەنەدا بیرێك لازمی بۆ ئیجراکردنی بەیانکرا، ولەعەقەب ئەوەوە لەتەرەفی ئیبراهیم کەمال بەگ و سائیری زەواتی ترەوە موتەعەددەدی خوتبەی موئەسیرو بەلیغ خوێندرایەوە لەسەر عەدەدی مەقسود وەغایەی تەعانی ئەفکارکرا لەنیهایەت بەڕای عمومی قەراردرا کە هەیئە تێکی تەمسیلیە تەشکیل بکەن و بەواستەی ئەم هەیئەتەوە مەتاڵێبی خۆیان عەرزی ئەعزاکانی عوسبەتی ئەلئومەم بکەن وە بۆ ئەم جەمعیەتە پەنجا زات ئینتخاب کرا. وە بەسورەتی رەسمی جەمعیەت تەشکیلی کرد، وە دەستکرا بەفەعالیەت و تەشەبساتی لازمە. ئەم جەمعیەتە ناوی (جەمعیەتی مودافەعەی حدود)ە وە دەرەجەی فەعالیەت وە تەشەبساتی جەمعیەت پێ دەرچێ لەغەزەتەدا نەشر ئەکرێ.

ژیانەوە، ژ (١٥)، ل (٣)

لەغەزەتەکانی عەرەبیەوە

ڕۆژی ٢٦ کانونی ساڵی ١٩٢٥ سەعات پێنج هەموو خانەدان و عولەماو وتەن پەروەرانی موسڵ لەدائیرەی بەلەدیەدا گرد بوبوونەوە بە شەوقێکی زۆرو بەحەرەکەتێکی بەشدەت ئەیان ویست ئەم هەیئەتەی کە لەتەرەفی جەمعیەتی ئەقوامەوە هاتوون وەختێ گەیشتنە موسڵ بیانبین وە قەسدو مەرامی خۆیان بەوان بگەیەنن زاتەن حزبی ئیستقلالی عیراق لەم خسوسەوە ئیجتماعیان کردبوو وایان بە موناسیب زانی بوو بۆ موحافەزەی حدودی موسڵ کە جوزئی لایەنە جەزای عیراقە جەمعیەتێ بەناوی (جەمعیەتی موداعەفەی حدود) تەشکیل بکرێ و تەقریرێکی بەقوەت لەخسوسی مەسئەلەی موسڵەوە بنووسن و بیدەن بۆ جەمعیەتە کە لەتەرەفی جەمعیەتی ئەقوامەوە هاتوون لەموئەسسینی ئەم جەمعیەتە پەنجا کەس ئینتخاب کراو ئەوانیش پانزدە کەسیان هەڵبژارد کە هەیئەتی تەتفیزیەبن لەو وەختەدا بەعزی منەوەران و وتەنپەروەران بە هەیە جانێکی میللەتەوە هەریەکە خوتبەیەکی بەلیغی خوێندەوە بە سورەتێکی موختەسەر بەیانیان کرد کە ئەم ئیتفاق و ئیجتماعانە دەلیلە لەسەر ئەمە کەجەمیعی ئەو لادی ئەم وەتەنە عەرەبین و

تورکمان نەویستووەو نامان ئەویٚ زاتەن تورك بەلاٚیەکی گەورەبوو خودا لەسەرمانی هەڵگرت قەومی عەرەب کەسێزدە عەسرە مەدەنیەتی بەدنیادا بلاٚو کردبوەوە بەمەحەزی ئەمەکە خیلافەت لەئاخریدا دەست تورك کەوتبوو ئیسلامەتیش بیٚ خەلافەت نابیٚ تابیعی ئەوان بووبوین لەپاشا خۆیان خەلافەتیان لەخوکرد نامی عوسمانیو پادشاکانی عوسمانیان کەم کرد شەرعیەتیان هەڵگرت بیٚ دینیان رەسمەن نەشرکرد مەدرەسەکانیان بەزۆر پێوەدا ئیتر چ حەقێکیان بەسەر ئێمەوەماوە لەجێیەك کە هەموو دەوڵەت موتەمەدینە ئەوروپا حەقی حەیاتو ئیستیقلالی ئێمەیان قبوڵو تەسدیق کردبیٚو ئێمە عونسرێکی غەیری ئەوان بین‌و ئەم هەموو خراپەیەمان لەوان دیی چیان لەئێمە دەویٚ.

ژیانەوە، ژ (١٥)، ل (٣)

## عەلاوەی غەزەتەی ژمارە ١٥ی ژیانەوە

بۆ مودافەعەی وتەنی موعەزەزو موحافەزەی حدودی حازرەی ویلایەتی موسڵ تەزاهوراتو تەشەبساتێکی وتەنپەروەرانە کە لەتەرەفی عمومی عێراقیەکان و بیلخاسە لەتەرەفی ئەهالی وەجەمعیەتی مودافەعەی موسڵەوە ئیجراکراوە موجەبی سەروەریەکی عەزیم‌و مەداری تەشەکورو ئیفتخاری عمومی ئەهالی سلێمانی بوو، بۆ ئەم وەزیفە وەتەنیە و حقوقی مەشروعەمان کەمودافەعەی بکەین مورەکەب لە عمومی ئەشراف عولەما ،سادات، تیجار، زەراع و سائیر سنوقی ئەهالی بەناوی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەنەوە جەمعیەتێکی گەورە تەشکیلی کرد. غایەو ئەساسی مەقسەدی ئەم جەمعیەتە موحافەزەی حدوودی ویلایەتی موسڵە کە جوزئێکی لاینفەکی عێراقە.بۆ تەئمیمی ئەم غایەو مەقسەدە بەهەموونەوعیٚ سەعی و تەشەبس کردنی جەمعیەت بەوەزیفەیەکی ئەساسیەی عەد ئەکاو لەم خسوسەوە لە تەرەفی هەر جەمعیەت و هەر فەردێکی عێراقیەوە هەر تەشەبسسات و ئەقداماتی واقیع ببیٚ لەتەرەفی جەمعیەتی ئێمەوە نائیلی موزاهەراتی موتلەقە ئەبی.

١٥ شوبات ١٩٢٥

بەناوی جەمعیەتی مدافەعەی وەتەنی سلێمانی

موعتەمەد ئەحمەد

سەرنج:

ئەم بەیانە وەك پاشکۆیەکی ژمارە (١٥)ی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) بلاٚوکراوەتەوە.

## خەبەرێکی موسڵ

ئەوقاتی بەغدادیە دوێنیٚ شەو تەلەگرافێکی لەموخابەرەی موسڵەوە وەرگرت (قویسیۆن حدود) مولاقاتو موزاکەرەی لەگەڵ وەکیلەکانی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەنیەکردو ئەو جەمعیەتە ئەوراقێکی موفەسەلی تەقدیمکرد دائیر بەئیسپاتی ئەوە کە موسڵ بەهەموو مەعنایەکەوە وە بەنەزەر عونسروە تاریخ وەئیقتساد وەعەسکەریەوە جوزئێکی عیراقە قومسیۆنەکە گەیشتنی ئەوراقەکەی بەیان کردو وەعدیدا کە عادیلانە تەماشای بکا لەئەسنای مولاقاتەکەدا قەڵەبالغێکی چەند هەزارکەسی دەوری مەوقیعی

قومسیۆنەکەی دابوو وەئیزهاری ئەوەیان ئەکرد کەبەشدەت وەحەرارەت تەرەفداری تەلەبی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەنیەئەکەن. کە وەکیلەکان لەبیناکە هاتنە دەرەوە قەڵەبالغەکە زۆر بەحەرارەت بانگیان ئەکرد (هەر بژی عیراق، هەر بژی مەلیك فەیسەڵ)

ژیانەوە، ژ(١٦)، ل (٤)

سورەتی تەلەغرافێك کە لەتەڕەفی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەنی موسڵەوە جوابەن بۆ عمومی ئەهالی سلێمانی هاتووە

بۆ عمومی ئەهالی موحتەرەمی سلێمانی

ئەی برا عەزیزەکان! ئێوە مەعلوماتتان ببێ ئەو وەتەنە عەزیزەی ئێمەیە دەفعی ئەو تورکانەی کرد کە تەلەبی تەزعو پارچە پارچە بونی مەملەکەتەکەی ئێمەیان دەکرد وە ئەیان ویست قەتلی رۆحی وەتەنەکەمان بکەن. عەجەن ئێوە ئەو فەزائیعو فەلاکەتانە دەرخاتر ناکەن کە تورکەکان لە مەملەکەتەکەی ئێمەدا کردیان وە بۆیان بەجێهێشتین؟ ئایا ئێوە نازانن کە حکومەتی تورك حوکمەتێکی دینیەو ئیحترامی دیانەت ناکا ئیلا خزمەتی عونسرەکەی خۆی نەبێ کە تورکیەتە!

حەربی عمومی ئێمەی نەجاتدا لەدەست عەبدایەتی وەئیهانەتی تورکەکان خودا ئێمەی هیدایەتداو فرسەتێکیشی بۆ رێکخستین‌و ئێمەش خۆمان دەرکمان کردوە تەشکیلی حکومەتێکی عیراقیەمان کرد، کە ئەم حکومەتە مورەکە بە لەنەوجەوانانی کورد نەجیب‌و عەرەب. ئەم مەملەکەتەی ئێمەیە عیراق ئەبەدەن جوێ نابێتەوە وەئەحەدا لەئێمە رازی نابێ کە دەفعەیەکی تر ئەو قەڵای حکومەتیە کە ئێمە دروستمان کردووە لەتەرەفی دوشمنی ئێمەوە بڕوخێنرێ.

ئەو حەمیەت‌و حەماسەتەوە نیە کە لەتەڕەفی ئەهالی سلێمانیەوە ئیزهارکرابوو تەبلیغی عمومی ئەهالی موسڵکراو ئەو مەتاڵیبەی کە ئەوانیش دەرمیانیان کردبوو مەتاڵیبێکی مەعقوڵ وەچاك بوو بووبە باعیسی فەرح‌و سرورێکی زۆر، ئەهالی موسڵ تەمەنای ژیانتان دەکا وەکو برایەك کەتەمەنای ژیانی برایەك بکات‌و دەوام کردنیش لە ئێوە ئەمەل دەکەین خودا یاریدەدەری هەموو لایەك بێ.

ژیانەوە، ژ(١٧)، ل (٢)

## کورد و تورك قەتعیەن پێکەوە ناژین

فائیق سەبری کەخۆی تورکەو مەئزونە لەدار ئەلفتونی سۆربۆن وەیەکێکە لە موتەحەسینی عیلمی ئەقوام‌و جواغرافیا لەکتێبێکدا لەبەحسی ویلایەتی موسڵدا وەها بەحس ئەکات: (سەکەنەی ویلایەتی موسڵ بەئەکسەریەتی عمومی میلەتی کوردە ئەم میلەتە جەسورەدا ئێمەن مقابیل بە حکومەت لەشەڕو موحارەبەدان هەموو ئەفرادێکی ئەم میللەتی بەلا ئیستیسنابە تفەنگ‌و دەمانچەو خەنجەر موسەلەحن. حەتا ئەوانەی کە عاجزن لەئیدارەو مەعیشەت موتلەقەن ساحێبی سیلاحن لەبەر ئەمەدا ئێمەن مقابیل بەحکومەت شەڕیان کردووەوە دەیکەن وەچەن تابورو ئاڵایان مەحوو بێ نیشان کردووە.

بۆ تەسهیلاتێکی زۆر بێ ئەهمیەت دەبێ موتەسەریف خۆی لەگەڵ قوەتێکی زۆر موهیم بچێت بۆ ئیش. وەئەلحاسل ئەم میللەتە بۆ حکومەتی تورك قەتعیەن قابلیەتی ئینقیادو مل شۆڕکردن نییە).

لەم بەحس و بەیاناتەدا وەها دەرکەوتووە کەمیللەتی نەجیبەی کورد لەزەمانی ستوتیانا دیسان حکومەتی تورکیان نەویستووە. وەمقابیل بە زوڵم و مەعامەلەی نابەجێی تورکەکان دائیمەن موسەلەح بوون و شەڕیان کردووە وە قەتعیەن تاعەتیان بەحکومەتی تورك نەکردووە ئینجا ئەمڕۆ کەمیلەتی کورد زیاتر تەرەقی و ئینکشافیان کردووە چۆن رازی دەبن کە جارێکیتر بچنەوە ژێر تەوقی ئەسارەتی تورکەکان و ئیتاعەتیان پێ بکەن ئەمە شتێکە کەحاسیل بوونی تەتعیەن قابیل نییە.

وەکو تورکەکان خۆیان ئیعترافیان بەم ئەحواڵەکردووە ئەڵبەتە عالەمی جیهانیش قەتیعیەتی بۆ حاسیل بووە کە کوردو تورك تەفعیەن پێکەوە ناژین و یەك گیر نابن.

عەبدولمەجید

ژیانەوە، ژ(١٧)، ل(٢)

لەغەزەتەی ئەلموفیددا

لەبابەت بەعزێ ئەحوالاتی ئەخیرەی هەیئەتی حدود لە موسڵ بەم نەوعە نووسراوە!

ئەهالی لەئەترافی قەسری کە بۆ(...) هەئیەتی کە دانراوە کۆبوونەوەو هاواریان ئەکرد (بژی عیراق لەگەڵ حکومەتی تورکیا وەپایەداربێت جەلالەتی مەلیك) لەپاش نیو سەعات سیان لەئەعزاکان کە چوار پاشایشی تیابوو چوونە شارەوە، ئەهالی هەموو لەجادەکانا بوون و بانگیان ئەکرد (ئێمە عەرەبین و عیراقین بژی عیراق لەگەڵ تورکیا) ئەعزاکەی تورك بە چەهرەیێکن.. بە ڕێگادا ئەڕۆیشت فەقەت دوو ئەعزاکەی تر بەسەر بڵندی ئەگەڕان، بۆ هەر کوێیەك ئەچوون عەینی نمایشیان چاو پێ ئەکەوت.

ڕۆژێك هەیئەتەکە چوونە شارەوە تەڵەبەی مەکتەبی خەزەریی و مەکتەبەکانی سانەوی نمایشێکیان ئیجراکرد کە پۆلیس نەی ئەتوانی مەنعیان بکات، یەکێ لەتەلەبەکان خوتبەیەکی خوێندەوەو وتی (ئێمە عەرەبین و عیراقی حەیات وەمەمامتمان مەربوتی وەتەنەکەمانە لەبەر ئەمە خەبەر بدەن بەعوسبەت ئەلئومەم کە هەتا منداڵێکیش دەرکی پێ ئەکا کەموسڵ عەرەبە) هەر ئەو ڕۆژە هەیئەت چوون بۆ نینەوا کە لەوێش عەینی موزاهەراتیان دی، ڕۆژی شەمە جەمعیەتی مودافەعەوە حزبی ئەلئیستقیلال وە ئەشراف زیارەتی هەئیەتەکەیان کرد.

ڕەئیسی هەیئەتەکە نوتقێکی بە فەرەنسزی خوێندەوە کە بەیانی وەزائیفی هەیئەت وەحسن نیەتیان دەرحەق بەئەهالی ئەکرد نوتقەکە بەعەرەبی تەرجومە کرا. لە ئەوەلەوە ویستیان بەتورکی بی خوێننەوە سامعین بە شدەت ڕەدیان کردەوە وتیان ئێمە عەرەبین و ئامانەوێ گوێ لەتورکی بگرین.

ژیانەوە، ژ(١٨)، ل (٢)

## ویلایەتی موسڵ

ویلایـــەتی موســـڵ دەورەی تـــەنزیماتی حکومـــەتی عوسمـــانی کـــە لـــە ١٢٨٠ دەستی پێکردووە لەگەڵ ویلایـەتی بەسرەدا هـەر لەتـەرەفی وەزیرێکی فـەوق ئـەلعادەی تورکـەوە کە لەبەغداد دائەنیشـت ئیداره ئـەکرا وە قسـمی کوردسـتانی کـە لەویلایـەتی موسڵدا بوو بەسورەتێکی مومتاز تـەودیع بەسلالەی بابان کرابوو لە تـەرەفی ئەوانـەوە ئیداره دەکرا.

ئـەو قسـمەی کـە لەتـەرەفی بابانەکانـەوە ئیـداره دەکـرا عیبـارەت بـوو لـە سلێمانی، قـەڵاچوالان، کۆی، حـەریر، هەڵەبجـەو بـەعزەن کـەرکوك کـە ئـەم موحیتـە جگـە لـە موناسـەبەتێکی سیاسـی جوزئـیێ لەگـەڵ حکومـەتی تورکـا هیـچ دەخلێکی نەبووە.

ئەمە تاریخەن سابتە؛

وەقتێ کە لەئەوائیلی نیوەی دووەمی عەسری سیانزدەهەمی هیجریدا بە زەربەی تەفرەقەی کۆیە نیهایەت بەحکومەتی مومتازەی بابان هێنرا، ئەو ئەیالەتەی کە لەتـەرەفی بابانەوە ئیداره دەکرا رەئسەن عەلاوەی بەغدادکرا. وە ئەوسا عیراق بەئەیالەتێکی مومتازە حسوب بووە وەمورەکەب بوو لەویلایـەتی موسڵو بەسـەرەو لەتـەرەفی وەزیرێکی فـەوق ئەلعادەی تورکەوە ئیدەرەدەکرا. فەقەت وەکو عەرزمان کردن لەپاش دەورەی تەنزیمات وە تەقسیماتی ئیـدارەی ویلایـەتی موسـڵ لەتـەرەفی حکومـەتی تورکـەوە تەشـکیل کـراو عیبارەت بوو لەلیوای موسڵ، کەرکوك، وە سلێمانیو ئەم تەشکیلاتە هەتا سقوتی تورکیا دەوامی کرد فەقەت لەگەڵ ئەوەشدا لەموحەرەراتی رەسمیەی تورکیادا دیسـان ویلایـەتی موسڵ، بەسرەوە بەغداد بەعیراق ناودەبرا.

تەشکیلاتی عەسکەریەی ئەم (٣) ویلایەتە موشتەرەك بووەو هەر ویلایەتەکە بەناوی (التنجی ئۆردۆ)ەوە تەقسیم کراو مەرکەزیشی لە بەغداد بوو.

لەپاش موتارەکەو جیابوونەوەی عیراق لەتورکیا حکومەتی تورکیا رەسمەن ئیعلانی کرد کە هـەر زابتـانو مـەئموری کە ئـەهلی عیراقن مـەئزونن بچنـەوە عـیراق وە بـەحدودی حازرەیەوە زابتان وە مەئمورانی ویلایەتی موسڵ تەرخیسکرد. ئەمەش دەلیلێکی تـەواوە کە حکومەتی تورکیا رەسمەن ئیعترافی کردووە بەعیراقێتی ویلایەتی موسڵ.

ئەگـەر سـەرفنەزەر ئەلحانـەش بکـەین وەبێینـە سـەر باسـی مللیـەت هـەموو کـەس دەیزانی کەئەکسەریەتی ویلایەتی موسڵ کورد وەعەرەب تەشکیل ئەکا. ئەوە بێ شوبهەیە کە عەرەبەکانی ویلایەتی موسڵ لە عیراق زیاتر هیچ شتێکی تریان ناوێ. وەبێینەوە سـەر کوردەکانی ئەو ویلایەتی ئەگەر بەپێی ئامالی خۆیان حکومەتی کوردیە تەشکیل نـەکرێ، وە کوردستـانی سـەرەوە کە ئێسـتا لـەژێر پێی تورکی زاڵمـا ئـی ناڵێنـێ نـەجات نـەدرێ بێشكو شوبهە ئیتحاد لەگەڵ عیراقا تەرجیع دەکا لە بۆنـەی خزمـەتکاری تـورك. ئەمـەیش لەنوقتەی ئیقتسادیاتو تیجارەتو موحافەزەی مەوجودیەتی ملیەی کورد شتێکی لازمو سـەریحە، وەهیـچ کوردێـك نییـە دەفعەیەکـە کەبیـەوێ بچێتـە ژێـر بـەندی ئەسـارەتو ئیسـتبراری تورکـەوە، چونکـە ئەوسـا هـەر سـەروەت، ئیقسـادیات، تیجارەتمـان مـەحو

نابێتــەوە، بەڵکــە ناموســی میللــی مەوجودیــەتی قەومیــەمان ئەکەوێتــە تەهلوکــەوەوە دەفەوتێ.

رەشید نەجیب

ژیانەوە، ژ (١٨)، ل (٢)

لەئەلعالم ئەلعەرەبیەوە کە لەنەجمەدا نووسراوە:

تەسرەیحاتی مەندوبی ئەلسامی لە موسڵ

رۆژی شەمەی حەوتی ئەم مانگە جەنابی موعتەمەدی ئەلسامی (سێرهانری دوس) بەتەیارە چۆتە موسڵ، ئێوارەی رۆژی یەکشەمەی ٨ی مانگ لەدائیرەی موتەسەریفیەتی موسڵدا سێ سەدکەس لەئەشراف، توجار، روئەسای رۆحانیەوە گەورە گەورەی موسڵدا مولاقاتی کردووە، لە خسوسی وەزعیەتی حازرەی وەزائیفی ئەنجومەنی جەمعیەتی ئەقوامە وە گفتوگۆیان ئەکرد وە وتویەتی "لە نەزەری ئەنجومەنی موحتەرەمدا بەقەنعی تەحقیقی کرادووە کە موسڵ وە ئەواحیەکانی عەرەب و عیراقین. ئەمە لە نەتیجەی پێنج سەعات گفتوگۆ کە لەگەڵ ئەنجومەنی موحتەرمدا کردوومە تێگەیشتم ئەنجومەن هیچ شوبهەیەکی نەماوە کە موسڵ عەرەبن، لە پاش بەیانکردنی ئەم خسوسانە تەبریکی موسڵیەکانی کردووە کە لەتەلەبەوە ئارەزووی خۆیاندا مۆفەق بن.

ژیانەوە، ژ (١٨)، ل (٤)

مەسئەلەی حدودی شیمالی

ئاژانسی رۆیتەر

راپۆرتی قومسیۆن حدودی موسڵ ئیسدار کراوا بەیان ئەکا کە قەتعەن کە تەجزئی نەکاوە وامولاحەزە ئەکا کە موناقەشاتی میهمەی ئیقیتسادی‌وە جوغرافیەوە کەزالیکە حەسیاتی ئەکسەریەتی ئەهالی تەرەفداری ئەوەیە کە لەگەڵ عیراقدا بێ ئەگەر مەملەکەتە کەبیست و پێنج ساڵ لەژێر کۆنترۆڵی عوسبتی ئەلئومەمدا بمێنێتەوە بەو نەوعە کە ئامالی کوردیە رەعایەت و ئیحترامی ئیدارەی سیاسیەو عەدلیەیان بکرێ و کۆنترۆڵی مەعاریفی مەنتیقەی خۆیان بکەن. شایەد کۆنترۆڵی عوسبەتی ئەلئومەم لە خیتامی مەعاهەدەی ئینگلیزو عیراقدا لەپاش چوار ساڵی تەواو ببێ ئەو وەختە بۆ مەملەکەتەکە وا نافعە کە لەژێر ئیدارەی تورکدا بمێنێتەوە کە داخیلی وەخاریجی ئەحوالی سەلامەتی ئەو بەبێ قیاس موافیقترە لە هینی عیراق.

بەهەرحاڵ ئەبێ عیراق مەنتیقەی دیالەی تیا بمێنێ بۆ مەقاسیدی ئیسفاو ئەڕوا، قویسیۆن توسیە ئەکا کەشایەد تەحەبوزی قەرار بدرێ حدود تەقریبەن (زابی سەغیر) تەعقیب ئەکا قەراری نیهائی خراوەتە دەست عوسبەتی ئەلئومەم، وا رای بەیانکراوە کە هەر قوەتێ ئیدارەی بەدەستەوە بێ بەسەر مەملەکەتەکەدا موناسیباتی تیجاربیە بەدەست ئەو قوەتەوە بونی زەروریە، بەیانات وەئیفادات بەدەلائیل وەبەراهێنەوە بۆ ئەم موتالەعاتە لەتەڕەف قۆمیسیونەوە تەقدیم ئەکرێ.

قۆمیسیۆن بەیان ئەکا وە لەو فکرەدایە کە مەسئەلەی ئەم قتعە موتەنازیع فیهیە ئەوەندە موختەڵیتە کە تەنها هەر مولاحەزاتی عونسریی مومکین نییە حیساب بکریٚ بەهەمەن حاڵ حدودی منوەتە بەشکاندنی سیلسیلەی تاریخیەوە، هەر چەند لەنوقتەی حەقانیەتەوە مەملەکەتەکە ئەبیٚ بەجوزئیٚکی... تورك تەماشا بکریٚ. هەتا مەملەکەتەوا زلە حەقی خۆی ئەهیٚنیٚ عیراق هەر حەقیٚکی ئجتماعی وەیا عەقڵی هەیە، قۆمیسیۆن موقابیل بەتەرەقیو تەعالی مەملەکەتەکە کەبەسایەی ئیدارەی بەریتانیاوە پەیدای کردوە حزبە گوزاری شوکرانو تەقدیرە.

قومیسیۆن بەیانی کرد کە ئەکسەریەتی نفوس تەرەفداری ئیلتحاقی عیراقە، ئیٚستنادیە دەوامی کۆنترۆڵی عوسبەتی ئەلئومەمو ئیلا تەرەفداری ئەوە ئەبوون کە ئیعادە بکریٚتەوە بۆ تورکیا.

ژیانەوە، ژ (٣٥)، ل (٢)

وەزارەتی خارجیەی تورکیا تەبعی (کیتابی ئەلئەحمەر) کەموتەعەلیقە بەمەسئەلەی موسڵەوە تەواویکرد. وە نوسخەیەکی تەقدیمی سەفیری بەریتانیا لەئەنقەرەکرد

ژیانەوە، ژ (٣٩)، ل (٣)

مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەمو

ڕۆژیٚك دواخستنی مەسئەلەی موسڵ لەسەر ویستنی تورك

لەندەن ٢ ئەیلول: ئەمڕۆ گرد بوونەوەی مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەمدا مەندوبی تورك داوای ڕۆژیٚك دواخستنی مناقەشەی مەسئەلەی میهمەی موسڵی کرد.

میستەر شامبوان وەزیری خارجیەی بەریتانیا مەوافەقەتی نواند فەقەت وازیحەن بەیانی کرد لەم واقعەیە زیاتر هیچ تەئخیراتیٚکی تر ببیٚ بە قەتعی قبوڵ ناکریٚ، لەبەر ئەمە مەجلیس بۆ ڕۆژیٚك قەراری دواخستنی مناقەشەیدا لەسەر ویستنی مەندوبی تورك.

ژیانەوە، ژ (٤٠)، ل (٢)

کەی قەراری عوسبەتی ئەلئومەم دەرئەچیٚ

لەبابەت موسڵەوە

لەندەن: لەپاش تەماشاکردنی مەسئەلەی موسڵ عوسبەتی ئەلئومەم حەواڵەی هەیئەتیٚکی سیٚ کەسی ئەکا کە ئەوەلیان ئاسویچرەیی، دووەمیان ئەسپانیولیوە سیٚیەمیان لەجەمهوریەتی ئاراغوای یەکیٚکی ئەمریکاییە. لەبەر ئەمە ئومیٚد ناکریٚ تا دوو حەفتەی تر لەم خسومەوە قەراریٚکی نیهائی بدریٚ.

ژیانەوە، ژ(٤٠)، ل (٢)

پەیمانی میستەر ئیمری لەبابەت موسڵەوە

جنوە: لەو کونفرانسەدا کەمیستەر ئەمری بۆ ساحیبی غەزەتەکان وتبووی، بەیانی کردووە کە حکومەتی بەریتانیا عەزمی هەیە لەتەواوبوونی مەعاهەدەکەدا موتابیقی شروتی عوسبەتی ئەلئومەم مەعاهەدەیەکی تازەی لەگەڵ عیراق عەقد بکا. وە وتی بەریتانیا لەو فکرە لای نەداوەو لانادا کەسەعی بکا بۆ تەرەقیو تەعالی عیراقو بۆ هێنانە سەر وادەیەك کەعیراق بتوانێ خۆ بەخۆ ئیدارە بکاو بتوانێ لەعوسبەتی ئەلئومەمدا ئەعزابەتی بکا.

وتی ئەگەر ئەو حدودەی کەمەتلەبمانە دەست بکەوێ ئەبێتە باعسی موحافەزەی سەلامەتی وە ئەگەر عەکسی حاڵی واقیع ببێ لەهەموو رووییەکەوە مەسئەلەی کەسب وەخامەت وەتە هلوکە پەیدا ئەکا.

لەجنوەوە تەلەغرافێك بەتاریخی (٤)ە نەهاتووە ئەڵێ میستەر ئیمیری لەسەر ئەو کۆنفرانسەی کە بۆ ساحیبی غەزەتەکان وتبووی بەستی هەقالکردو وتی تورکەکان لەنوقاتی عیلمی ئەجناسی بەشەر وەعیلمی ئیقتیساد وەسەوقی ئەلجەیشەوە دەلائیل ئیبرازئەکەن وە ئەلحاڵ لەنەتیجەی تەحقیقاتی هەیئەت دەرکەوتووە کەخەڵقی ویلایەتی موسڵ تەرجیحی حکومەتی عیراق بەسەر حکومەتی تورکدا ئەکەن وە ئەو بەیاناتی تورکەی رەدکردەوە کە ئەڵێن لەبەر بەعزی ئەسباب کە حکومەتی عیراق تەوەسلی پێ کردووە هەیئەتی حدود بەکەمالی سەربەستیەت ئیجرای تەحقیقاتیان بۆ نەکراوەو تەکزیبی ئەو بەیاناتەی کرد کە لە حسوسی تێکچونی سلێمانیەوە بەست کرابوو وە سوالی کرد کە ئایا حکومەتی تورك حازرە بۆ دانی ئیمتیازاتی ئیداریە بەکوردەکانی ویلایەتی موسڵ کە ئێستا لە عەهدی حکومەتی عیراقیەدا پێی دراوە ئەگەر شایەد بوو یان ئیعادە بکرێتەوەو لەمەسئەلەی شایەدەوە وتی هەموو حکومەتەکان موعتەریفن بەئینتدابی سوریەو فەلەستین حکومەتی بەریتانیا تەلەبی تەمادی حاڵی حازرە ئەکا مەسئەلە تەعینکردنی حدودی بەینی دوو حکومەت زیاتر نییە ئەما بەهیچ نەوعێ بێ حکومەتی بەریتانیا موسیرە بەمانەوەی حدود لەسەر وەزعی حازر تاخەتی برۆکسل. دیسان بەیانی کرد کە حکومەتی بەریتانیا مەوافەقەت ئەکا بۆ موراعاتی ئەقەلیات کە داخیلی عیراقە لەلایەنی عوسبەتی ئەلئومەمەوە نیابەتەن عوزوێك بنێرێت، بەشەرتێ تورکیش عەینەن قبوڵی بکات ئەو ئەقەلیانەی کە لەداخیلی مەنتیقەی تورکدایە عوسبەتی ئەلئومەم قۆنترۆڵی بکات.

ژیانەوە، ژ (٤٠)، ل (٤)

رای ئارل بەرکەهید

لەبابەت موسڵەوە

لوندرە: لەو کۆنفرانسەی ئارل بەرکەهید کە لە ئوکتۆبەر داویە ئەڵێ: (ئەگەر تورکەکان لەشیمالی عیراقدا دابمەزرێت، حەیاتی مەملەکەتەکە ئەکەوێتە تەهلوکەوە کە لەبەر کەمی ئیدخالات موساعید نییە مقاوەمەتی هجومی تورك بکا).

وەسەربەخۆ هێشتنەوەی عیراقیش مەوافیقی عەدل و ئینساف نییە لەدواییدا بەحسێ لەئەحوالی موئەلیمەی سودان و قەتل عامی جیهانی سائیرەی سودان وەخەرتوم کە لەپاش تەخلیە رویدابوو گێڕایەوەو وتی:
(ئەگەر ئێمە لەعیراق خۆمان بکێشینە دواوە ئیر تکابی جورمێکی گەورە ئەکەین کە لەو جورمە کەمتر نابێ!..)
ژیانەوە، (٤١)، ل(٢)

مستەر ئیمیری
لەجنێف ناڕوا
میستەر ئیمیری عەزمی مانەوەی لەجنێف کردووە تاحەل و بڕینەوەی مەسئەلەی موسڵ، لەگەڵ ئەمەی کە بەنزیکێکی زوو بڕینەوەی ئومێد ناکرێ، چونکە ئەو هەیئەتە فەرعیەیە کە عوسبەتی ئەلئومەم تەشکیلی کردبوو هێشتا دەستی بەگردکردنەوەی دەلائیل و بەراهێنی تەڕەفەین نەکردووە.
ژیانەوە، ژ(٤١)، ل (٣)

رۆیتەر
حەواڵەکردنی مەسئەلەی موسڵ
بۆ مەحکەمەی عەدلی لاهی
پاریس: غەزەتەی ئەلمانان لەموخابەرەی خاسی لەجنێفەوە خەبەری ئاتی وەرگرتووە ئەڵێ: شایعەیە کە مەسئەلەی موسڵ حەواڵەی مەحکەمەی عەدلی دائیمی لاهی ئەکرێ.
ژیانەوە، ژ(٤٢)، ل(٢)

هەیئەتی ٣کەسی کەتەهدیدی تورك ئەکا
لەندەن:
تەلەغرافێ لەجنێفەوە هاتووە ئەڵێ شایعە لەبەینی خەڵقدا دەوران ئەکا کە ئەو هەیئەتەی ٣ کەسیەی عوسبەتی ئەلئومەم وەمەسئەلەی موسڵ تەشکیلی پێکردبوو تەهدیدی تورك ئەکا ئەگەر راستی ئەم شکاتی مەندوبی بەریتانیا تەحقیق بکا کەمەسیحیەکان لەوەتەنی خۆیان تەبعیدکراون چونکە ئەمە بۆ نەتیجەی حوکمی مەسئەلەی موسڵ تەئسیری خراپی هەیە، والازمە لەسەر تورکەکان لەم کردەوانە کەمغایری مەدەنیەتە دەست هەڵگرن.
ژیانەوە، ژ(٤٢)، ل (٢)

## ئیجتماعی مەحکەمەی لاهی

لاهی: مەحکەمەی عەدلی دائیمی لاهی ئەعزاکانی دەعوەت کرد بۆ عەقدی جەلسەیەکی فەوقە ئەلعادەلە ٢ی تەشرینی ئەوەلدا بۆ تەماشاکردنی مەسئەلەی مەسیحیەکانی مەنتیقەی کۆیان.

وە بۆ تەماشاکردنی ئەو نوقاتەی کە عوسبەتی ئەلئومەم حەواڵەی کردبوو لە بابەت مەسئەلەی موسڵەوە بۆ ئەمەی لەم خسوسەوە رای خۆی بدا.

ژیانەوە، ژ (٤٣)، ل(٣)

## تورکیاو مەسئەلەی موسڵ

ئەستەمۆڵ: شرکەتی تەلەغرافی ئەناتۆل تەکزیبی ئەو خەبەرەی کرد کە غەزەتەی ئەڵمانان لە ١٥ی ئەیلولدا بڵاوی کردبوەوە کە حکومەتی تورکیا رەدو بەدەلی لەگەڵ مەندوبی ئەڵمان و روس کردووە لەبابەت ئیقتدارو ئیستعدادی عەسکەریەیەوە دائیر بەمەسئەلەی موسڵ.

ژیانەوە، ژ(٤٤)، ل (٣)

داخیلی:

## مەجلیسی ئەعیانی عیراق
### تەشەکوری وەزیری موستەعمەرات ئەکا بۆ حوسن مەودافەعەی لەمەسئەلەی موسڵەوە

لەندەن ١ت ١- رەئیسی مەجلیسی ئەعیانی عیراق یوسف ئەفەندی سوێدی تەلەغرافێکی بۆ میستەر ئیمیری وەزیری موستەعمەرات ناردووە لەم تەلەغرافەدا تەشەکوری نواندبوو بۆ حوسن مودافەعەوە ئیهتمام بەمیلەتی عیراق و بە موحافەزە بۆ زیفافەتی حدودی شیمالیەی عیراق کە لەمەجلیسدا ئیبرازی کردووە.

ژیانەوە، ژ (٤٤)، ل (٣)

رۆیتەر

میستەر ئیمیری دائیر بەموسڵ

لەگەڵ مەلیك جۆرج موباحەسە ئەکا

لەندەن ١٥-ت ١- میستەر ئیمیری بەگەیشتنە خزمەتی جەلالەتی مەلیك جۆرج موشەرەف بوو، ئەو رەدو بەدەلەی کە لەمەو پێش دائیر بەعیراق وە بیلخاسە دژ بە موسڵ شروعی پێکردبوو هەمووی عەرزی جەلالەت مەلیکی کرد، لەم جیهەتەوە لەپێش ئەمەدا لەبەینی جەلالەتی مەلیك جۆرج وە جەلالەتی مەلیك فەیسەڵدا بەحسکرابوو.

ژیانەوە، ژ (٤٥)، ل (٢)

حەرەکەتی جەنەراڵ لێدۆنەر
دوێنێ جەنەراڵ لێدۆنەر لەپاریسەوە بۆ تەحقیق وە تەدقیقی وەقعەی میهمەی کۆیان روو بەموسڵ حەرەکەتی کرد.
ژیانەوە، ژ (٤٥)، ل (٣)

خەبەراتی موتەفەریقە
میستەر ئیمیری تەئکیدی کرد کە حکومەتی بەریتانیا بەقەتعی موسڵ تەخلیە ناکا.
ژیانەوە، ژ (٤٥)، ل(٣)

رۆیتەر
مەسئەلەی موسڵ لەمەحکەمەی عەدلی لاهی
لاهی ٢٥ت ١- لەجەلسەی مەحکەمەی عەدلی دەولی لاهیدا سێردۆ گلاس هۆك، سێرسیسل هورست وەمیستەر واشیری ئەوقات بۆ تەحقیقاتی مەسئەلەی موسڵ حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا تەمسیل ئەکەن وە لە نەزارەتی خارجیەوە موستەعمەرات وەمالیەوە وەکیلیان لەگەڵدا ئەبێ.
ژیانەوە، ژ(٤٦)، ل (٢)

لەمەحکەمەی عەدلی دەولی لاهیدا
مەسئەلەی موسڵ و حازر نەبوونی مومەسیلی تورکیا
لاهی، ٢منە- مەحکەمەی عەدلی دەولی لاهی بۆ بینینی مەسئەلەی موسڵ ئەمڕۆ بەیانی جەلسەیەکی فەوقە ئەلعادەی بەست، لەم جەلسەیەدا مفەوەزی بەریتانیا لەلاهی سێر چارلس مارلئك وەمفەوەزی تورکیا لەلاهی محەمەد ئەسعەد بەگ، وەسوفەرای دەولە موعەزەمەکانی تر لەگەڵ ئەو هەیئەتەی کە لەحکومەتی بەریتانیاوە بەمومەسیلی تەعیین کراون حازر بوون ئەو جێگایەی کە بۆ مومەسلینی تورکیا تەخسیس کرابوو لەبەر حازر نەبوونی هەیئەتی مەزکور بەتاڵکرایەوە.
مەحکەمە، ئەو تەلەغرافەی کە لە تورکیاوە هاتبوو خوێندیەوە، لەم تەلەغرافەدا تورکیا بەتەواوی مەحکەمەی تەقدیرو ئیحترامی گرتبوو فەقەت بەیانی کردبوو کە حکومەتی تورکیا بۆ ئەم ئیجتماعە سەبەب لەمەیدانا نابینێ کە ناردنی مومەسیلی ئیستلزام بکا.
سێر دۆگلاس هۆك نوتقێکی دوورو درێژیدا، مەجلیس تەواو وەتەعلیق کرایە سوبحێنێ نێوەرۆ.
سێر دۆگلاس هۆك لەنوتقەکەیدا مەوادی ژێرەوەی تەسریح کرد.

مەوادی مەعاهەدە سابت و موحەقیقەکە ئەو قەرارەی جەمعیەتی ئەقوام ئەیدا قەرارێك ئەبێ مەوافیقی مەعاهدە نامەی لۆزانە لەبەر ئەمە ئەو قەرارە سەرفی لەشکلێکی تەحکیمیدا ئەبێ وەکو تورکەکان ئیدعا ئەکەن نەتەوەیی وەنەتەوەستی تیا ئەبێ.
بەرامبەر بەئیدعای فەتحی بەگ کە لەجنووەدا وتی مفەوەزیم بە قبوڵکردنی هەر تەعەهودی کەعائید بەحکومەتەکەم بێ ئەڵێم: مەسئەلەیەك کە لەتەرەفی حکومەتێکی بەشەڕەفەوە ساڵێك بەلا قەیدو شەرتی قبوڵ کرابێ وە ئەمڕۆ لە تەڕەفی مومەسیلەکانیەوە تێك بدرێ لەبینی ئەم نەوعە حکومەتانەدا تەئسیسی رابیتەی مەحاڵ ئەبینم.
ژیانەوە، ژ (٤٨)، ل (٣)

رۆیتەر
تەسریحاتی میهمەی وەزیری موستە عمەرات دائیر بەموسڵ
لۆندرە ٨ت ٢-وەزیری موستەعمەرات میستەر ئیمیری دوێ شەو لە (پۆرتسمۆت) وتویەتی ئومێدم هەیە بەجەمعیەتی ئەقوام لەمانگی پێشەوە ماندا دائیر بەموسڵ قەرارەکەی بدا. وە وتویەتی عەلاوەت ئەهمیەتی مەخسوسەی مەسئەلە بۆ هەموو عالەم ئیجاباتی موسالەمەتەکە جەمعیەتی ئەقوام قەرار بدا وەتەئیدبکات. ئارەزووی گەورەی حکومەتی بەریتانیا ئەمەیە کە مەسئەلەبەموسالەمەت حەل بکرێ. لەعەینی وەختا بەکەمالی عەزمەوە ئیسراری کرد لەسەر حقوقی خۆی وەحقوقێ ئەو میللەتەی کە ئیعتمادیان پێکردبوو قابینەی مەتەوالیەی بەریتانیا تەعەهودیان بەمیللەتی عیراقدا بوو کە مەیدانی نەدەن جارێکی تر بخرێتەوە ژێر ئیدارەی تورك، وەوەعدی بەعیراق دابوو کە حکومەتێکی حور وەموستەقیلیان بۆ تەئیدبکا.
حەسەب ئەلئیمکان مەعاونەت کرا، وەلەوەعدەیا وەفای نواند. فەقەت ئەمڕۆ حکومەتی تورکیا داوای لێ جوێ کردنەوەی دەوڵەمەندترین پارچەیەکی عیراق ئەکا، کە ئەم داوایەیش نەلەسەر دەلیلێکی قەومیە نەلەسەر ویستنی میللەتە. بەدەفعی وردی ئەم داوایە حکومەتی بەریتانیا لەو قەناعەتەدایە کە محافەزەی حقوقی خۆی کردووە..
وەحکومەتی بەریتانیا لە مودافەعەی ئەم مەسئەلەیەدا تەنها بەواسیتەی تەحکیم دەست هەڵ ناگرێ زەرورەتی حەس بکرێ موراجەعەت بە قوەتیش ئەکا.
ژیانەوە، ژ (٥٠)، ل (٢)

رۆیتەر
مەوعیدی دەرچوونی قەراری مەحکەمەی لاهی
لەبابەت موسڵەوە
لاهی ١٩ت ٢- مەحکەمەی عەدلی دوەلی لەلاهی رۆژی شەمەی تەعیین کرد بەمەوعیدی ئیجتماع، بۆ ئەمەی قەراری ئیستشاری ئیسدار بکا لەبابەت مەسئەلەی موسڵەوە کە جەمعیەتی ئەوام حەواڵەی کرد بوو.
ژیانەوە، ژ (٥١)، ل(٢)

رۆیتەر

حوكمی مەحكەمی عەدلی دەولی لاهی دائیر بەموسلّ

لاهی ٢١ت ٢- مەحكەمەی عەدلی دەولی لاهی حوكمی داوە كە جەمعیەتی ئەقوام لەپێش تەعینكردنی حدودی توركیاوە عیراق بەسورەتێكی قەتعی لزومیەتی نواندووە بە ئیعتای قەرارێك كەهەر دوولا عەمەلی پێ بكەم.

ئەو قەرارەش كە جەمعیەتی ئەقوام ئەیدا لازمە بە ئاڕای عمومی بدرێ، مەحكەمە لەو فكرەدایە كە مومەسلینی تەرەفین ئیشتراك بەئیعتای قەرار بكا.

ئەو مەسائیلە كە حەواڵەی مەحكەمەكراوە عائید بەتەحدیدی حدودی عیراق وەتوركیا نییە عائید بەسەلاحیەتی جەمعیەتی ئەقوامە. مەجلیسی(...) ئەگەر ئینگلیزوە یا تورك تەئخیری تەڵەبی نەكا لەجەلسەی ئاتیدا لە خسوسی تەحدیدی حدودەوە قەرار ئەدا.

حكومەتی بەریتانیا هەر لەئێستاوە قبوڵكردنی قەراری جەمعیەتی ئەقوامی بەیانكردووە. وەزعیەتی حكومەتی ئەنقەرە هێشتا مەعلوم نەبووە.

ژیانەوە، ژ(٥٢)، ل (٢)

قەراری عوسبەتی ئەلئومەم لەخسوسی مەسئەلەی موسڵەوە

لەجنوەوە بۆ فەخامەتی مەندوبی ئەلسامی بەغداد

رۆژی ١٦ی كانونی ئەوەلی ١٩٢٥

مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم ئەم پاش نیوەڕۆیە بە ئیجماعی ئارا مەوافیقی ئاتی قەراری حەلیدا.

١-حدودی توركیاوە عیراق مەوافیقی خەتی برۆكسل ئەبێ كە لەمەجلیسی برۆكسلدا لە ٢٩ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٤دا قەرار درابوو.

٢-مەجلیس، دەعوەتی حكومەتی بەریتانیا ئەكا كە بەپێی ئەو مەعاهەدەیەی لەگەڵ عیراقدا هەیانە وە لەتاریخی ٢٧ی ئەیلولی ١٩٢٤دا لە تەرەفی مەجلیسەوە تەسدیقكراوە مەعاهەدەیەكی تر بكا بۆ دەوامی ئینتداب بەسەر عیراقدا بۆ (٢٥) ساڵی تر. وە ئەم مەعاهەدەیە تەقدیمی عوسبەتی ئەلئومەم بكا. مەگەر كە لەپێش ئینقزای ئەم مدەیەدا عیراق خۆی لە مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەمدا تەمسیلی بكا مەوافیقی مادەی (١)ی قانونی مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم.

ئەگەر لەزەرفی شەش مانگا ئیجرای ئەم ئیتفاقە ئیقتران بەمەعلوماتی عوسبەتی ئەلئومەم بكا ئەو وەقتە مەجلیس ئیعلانی ئەكا كە ئەمە قەتعیەوە نیهائیە، ئەو وەقتە ئەو تەدابیرە بەیان ئەكا كە موقتەزیە بۆ تەئیمینی خەتی حدودی سالف ئەلزكر.

٣-حكومەتی بەریتانیا دەعوەت ئەكرێ بۆ ئەوەی كە لەداخیلی سەلاحیەتی ئینتدابی خۆیدا تەئمینی ئاسایشی كوردەكانی عیراق بكا. تەئمیناتێك كەلە بابەت ئەو

شکلی ئیدارەی مەحلیەوەیەکە لەتەرەفی لیجنەی تەحقیقاتەوە لەخیتامی راپۆردا تەوسیەکراوە.

٤-حکومەتی بەریتانیا دەعوەت ئەکرێ کە لەداخیلی سەلاحیەتی ئینتدابی خۆیدا هەتا مومکین ئەبێ رعایەتی ئەو ئیقتراحاتە بکا کە لەتەرەفی لیجنەی تەحقیقاتەوە بەیان کراوە لەبابەت تەدابیری تەئمینی تەسهیلاتی وەزعی بۆ مساوات لە بەینی عمومی عەناسیری مەوجودەدا، وەکەزا لەبابەت تەدابیری تیجاریەوە کە لەتەوسیەیەکی مەخسوسەی راپۆرەکەدا بەیان کراوە.

مولحەقی ژیانەوە، ژ (٥٣)

## بەموناسەبەتی قەراری عوسبەتی ئەلئومەم ئیحتفال

ئەم هەفتەی رابووردوە حەقیقەن هەفتەیەکی پڕ(......) بوو کەوتبووە دوای پایزو خەزان، ئافاق و تەبیعەت لەبەینی پایزو زستانا فەسڵێکی زۆر جوان و لەتیفی واگرتبوو، لەئەرزو ئاسمانا غوربارو عەمامی نەهێشتبوو مەگەر بەراعەتێ بوو بۆ هێنانی ئەم مژدەیەوە بۆ ئیزهاری شادمانی وە ئیشتراك بەم حەفلەیە، هەروەك مەشهورە پێنجشەمەو شەمە موبارەکە موژدەی قەرارەکەمان پێنجشەمە وەرگرت وەرۆژی جومعە تەئیدی کردو شەمە مەراسیمی ئیحتیفال بەجێ هێنرا.

رۆژی شەمە موسادیفی کانونی ئەوەلی ١٩٢٥ هەر لەبەرە بەیانەوە ئافاقی سلێمانی جوان و شیرین، هەوای نەسیمی سافو بۆ نخۆش، فەزاکەی نورانیوە بریقەداربوو، رۆیش لەکەمالی عیشوەو نازی ئاهەستە ئاهەستە لەئوفقەوە دەرئەکەوت، خەرامان خەرمان جلوەی ئەدا واهاتە پێشووە لەرۆژانێکە جوانترەوە روناکتر عەرزی ئەندامی کردبوو.

ئەمەلی مەملەکەت لەگەورە تا بچووك هەموو پڕ نەشئەوە خەندان وەدلکراوە بوون، مەگەر کە لەمەوجاتی ئەلەکتریکی لەناو نەسیمی عەنبەر بۆدا لەجنوەوە بەسەر شاخ و درەختەکانی ئەورووپاوە بەسەر هەموو شەپۆلی بەحری سپیدا تا گەیشتە ئێمە مژدەی پێبوو کە حەیات و سەعادەت قەتعەیەکی تەئمین کردووە یەعنی، مژدەی قەراری عوسبەتی ئەلئومەمیدا دائیر بەمانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ عیراق.

بەموناسەبەتی ئەم خەبەرە خۆشەوە رۆژی مەزکور ئیحتفالێکی زۆر گەورە وە تەن ئیجرا کرا مەوافیقی پرۆ غرام وە تەرتیباتێك کە لەمەقامی موتەسەریفییەوە رێکخرابوو لەسەعات چواری عەرەبیدا دەستە دەستە ئومەراوزابتانی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا وەجەیشی عیراق کە عیبارەت بوون لەجەنابی سەعادەتماب کرنیل براون قوماندانی عمومی عەسکەری لیوا وەجەنابی میستەر مەکریکەر زابتی ئیستخبارەوە وەکیلی موفەتیشی مەنتیقە لەگەڵ ئومەراو زابتانی جەیشی عیراقی وە ئومەرای لیوای ئینگلیزوە (...) وە دائیرەی پۆلیس و عولەماوە ئەشراف وەتوجاری مەملەکەتوە روئەسای دەوائیروە لەهەموو سنفی مەئمورین وە ئەهالی بەکە مالی شەوق و شەتارەت بۆ زیارەتوە ئیفای مەراسیم وە تەبریکات تەشریفیان هێنایە مەقامی موتەسەریفی وەلەوێدا لەپاش مولاقات وە بەجێ هێنانی لازمەی تەبریکات لەساعەت پێنج و نیوی عەرەبیدا جەنابی موتەسەریف لەگەڵ ئەم زەواتی موحتەرەمە تەشریفیان هێنایە بەر دەرگای سەرای قەدیم

بۆ ئەمەی هەموو فەردێکی میللەت لەم ئیجتماعە حیسە(......) ئەو ساحەیەی بۆ حەفلە ئیتخاز کرابوو لە حەقیقەتا موحفەلێکی مەحەلی بوو ناوەڕاستی ئەم جێگایە بەکورسی وە مێز رازانرا بوەوە لە ناوەڕاستی ئەم کورسیانەدا بۆ نوتق خوێنەرەکان مێزێکی گەورە دانرابوو.

لەپڕ لە باخەکەی سەرادا تاقمێکی گەورەی پۆلیس بەدرێژی باغەکە سەف بەستەی ئیحترام بووبوون، لەم بەرەوە بەلای جادەکەدا شاگردانی هەر دوو مەکتەب بەتاقمی کەشافەوە بەرامبەر پۆلیسەکان خەتێکی مەوازیان تەشکیل کردبوو، لەپشت ئەم دوو ریزەوە جمهورێکی گەورە لەهەموو تەبەقاتی موختەلیفەی ئەهالی بۆ بینینی ئەم ئیحتفالە، بۆ ئیشتراك بەم سرورە عەزیمە، بۆ گوێگرتن لەم نوتقە حەسبحالانە، وەبۆ تێگەیشتن وەمەسرور بوون لەم قەرارە موسەیب بە هەر چوار تەرەفی ئەو مەیدانە گەورەیەدا گرد بووبوونەوە، حاسلی ئەو وەقتە بۆ ئەهالی مەملەکەت ئانێکی بەختیاری، رۆژێکی پڕ فەرەح بوو، شاگردانی مەکتەب بەو دەنگە مەعسومانەیانەوە جار بەجار بە گۆرانیەکی وەتەنی سکونێکی عەمیقیان ئەخستە ئەو ناوەوە، وەگاهێ دڵی مەسروری سەیرکەرەکانیان ئەلەرزانەوە وە رۆحی پڕ نەشئەو شاتری ئەلەرانەوە، لەو ئانەدا تەشریف فەرمونی جەنابی موتەسەریف وە هەیئەتی موحتەریمە ئیعلان کرا. تەشریفیان فەرمووە ئەو جێگایەی کەئیحزارو تەزیین کرابوو دانیشتن.

ئەمجا لەتەرەفی شاگردانی مەکتەبەوە لەپاش نەشیدێکی بەخێرهاتن، جەنابی موتەسەریف بە نوتقێکی موئەسیروە بەخوێندنەوەی قەراری عادیلانەی مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم حەفلەکەی گوشادکرد، ئەوا عەینەن نوتەقەکە دەرەج و تەتقدیمی ئینزاری خوێندەوارانی کەرامی ئەکەین:

حەزاری کەرام:

بە فەرح و شادییەکی تەواوەوە مژدەتان ئەدەمێ مەجلیسی موحتەرەمی عوسبەتی ئەلئومەم قەراریدا کەویلایەتی موسڵ ئەبێ تەجزی بۆ عێراق بمێنێتەوە. مەزمونی قەرارەکەش ئەمەیە:

قەراری عوسبەتی ئەلئومەم لەخسوسی مەسئەلەی موسڵەوە لەجنوەوە بۆ فەخامەتی مەندوبی ئەلسامی بەغداد.

رۆژی ١٦ی کانونی ئەوەلی ١٩٢٥

مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم ئەم پاش نیوەرۆیە بە ئیجتماعی ئارا مەوافیقی ئاتی قەراری حەلی دا.

١-حدودی بەینی تورکیاو عیراق مەوافیقی خەتی برۆکسل ئەبێ کە لەمەجلیسی برۆکسدا لە ٢٩ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٤دا قەرار درابوو.

٢-مەجلیس، دەعوەتی حکومەتی بەریتانیا ئەکا کە بەپێی ئەو مەعاهەدەیەی لەگەڵ عیراقدا هەیانەوە لە تاریخی ٢٧ی ئەیلولی ١٩٢٤دا لە تەرەفی مەجلیسەوە تەسدیقکراوە مەعاهەدەیەکی تر بکا بۆ دەوامی ئینتداب بەسەر عیراقدا بۆ (٢٥) ساڵی تر. وە ئەم مەعاهەدەیە تەقدیمی عوسبەتی ئەلئومەم بکا. مەگەر کە لەپێش ئینقزای ئەم مدەتەدا

عیراق خۆی لەمەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەمدا تەمسیلی بکا مەوافیقی مادەی (١)ی قانونی مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم.

ئەگەر لەزەرفی شەش مانگا ئیجرای ئەم ئیتفاقە ئیقتران بەمەعلوماتی عوسبەتی ئەلئومەم بکا ئەو وەقتە مەجلیس ئیعلانی ئەکا کە ئەمە قەتعیەوە نیهائیە، ئەو وەقتە ئەو تەدابیرە بەیان ئەکا کە موقتەزیە. بۆتە ئمینی خەتی حدودی سالف ئەلزکر.

٣-حکومەتی بەریتانیا دەعوەت ئەکرێ بۆ ئەوەی کە لەداخیلی سەلاحیەتی ئینتدابی خۆیدا تەئمینی ئاسایشی کوردەکانی عیراق بکا. تەئمیناتێك کە لەبابەت ئەو شکلی ئیدارەی مەحەلیەوەیە کە تەرەفی لیجنەی تەحقیقاتەوە لەخیتامی راپۆردا تەوسیەکراوە.

٤-حکومەتی بەریتانیا دەعوەت ئەکرێ کە لەداخیلی سەلاحیەتی ئینتدابی خۆیدا هەتا مومکین ئەبێ ریعایەتی ئەو ئیقتراحاتە بکا کەلە تەرەفی لیجنەی تەحقیقاتەوە بەیان کراوە لەبابەت تەدابیری تەئمینی تەسهیلاتەوە وەسەعی بۆ مساوات لەبەینی عمومی عەناسیری مەوجودەدا وەکەزا لەبابەت تەدابیری تیجاریەوە کە لەتەوسیەیەکی مەخسوسەی راپۆرەکەدا بەیان کراوە.

موسەلەمەو ئینکار ناکرێ کەسەعادەتێکی زۆر گەورە بۆ عیراق‌وە بیخسوس بۆ سەکەنەی ویلایەتی موسڵ وەکوردەکان تەئمین وەرۆحیان بەبەراکرا، خۆ دیسان زۆر بەختیارین کە حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا دەعوەت کراوە کە تەئمینی ئەو لزومە بکا کە قۆمیسیۆنی عوسبەتی ئەلئومەم لەخیتامی رابوردا تەوسیەی کردبو، ئەمەش عەلامەتێکی سەعادەت وەمۆفەقیەت وەخاڵێکی خێرە.

ئەتوانم بڵێم رۆژی ١٦ی کانونی ئەوەل لەوانەیە کە بۆ ئێمە بەجەژنێك بژمێررێ، لەبەر ئەمە بۆ حکومەتی فەخیمەی بەریتانیاوە فەخامەتی میستەر ئیمسیری وەزیری موستەعمەرات لەعەهدەی تەشەکوراتدا دەرناچین کە بۆ ئەم مەسئەلەیە بە زلی عنایەت و عاتیفەتی گەورەیان فەرمووە هەر وەکو لێمان مەعلوم بووە لە پاش (......) زەحماتیەکی زۆر مۆفەق بوون بە ئیستحسال قەرارێکی وا بەشان وە شەرەف لەگەڵ تەقدیمی تەشەکوراتدا تەبریکیان ئەکەین.

ئەمرۆ بۆ قەومی کوردیش مەعلوم بوو کە هەیئەتی موحتەرەمەی عوسبەتی ئەلئومەم تەمسیلی (...) بۆ تەئمینی حقوقی میلی بیئەلخاسەی ئەقەلیات، هەروەها کەلازمەی عەدالەتیان بەجێ هەیە وەئەم قەرارە مونسیفانەیان دەرحەق بەئێمە ئیسرار فەرموو کە ئەبێ بە (...) وەحید بۆ تەئمینی سەعادەت وەئیقبال‌وە ژیانمان لەئەندازە بەدەر تەشەکوراتی خالسانەمان ئەگەیەنیت، یەکدەفعە بۆ ئێمە فرسەتێکی قیمەتدار هەڵکەوتوە وەهاتۆتە پێشەوە.

ئومێد ئەکەم قەدری بزانین، لەدەستی نەدەین، دەست بدەینە دەستی یەك‌و بەیەکدڵ‌و زیان بۆ پێشکەوتن وەسەرکەوتنی خۆمان هیمەت بکەین، ئیختلاف وەنیفاق کەموجەبی ئیزمحلالە ئینشائەڵڵا لەمەودوا لەبەیندا دەربچێ‌و (...) هێنم ئێمە کە بۆ تەرحە رێگایەکی باش‌وە مەواقفمان گرت شوبهە نییە ئەو وەقتە بەلوتفی وەشەفەقەت حامی موعەزەم ئەگەینە مەنزلی مەرام، لەخاتیمەدا مین سەمیمی ئەلقەلب لەگەڵ عەرزی تەبریکتان تەمەنی حسولی مۆفەقیەت ئەکەم.

لەدوای جەنابی موتەسەریف کاتبی موفەتیشی ئیداری جەنابی سەعید ئەدیب ئەفەندی وەکالەتەن نوتقی ئاتی خوێندەوە:

زەواتی موحتەرەم

جەنابی زابتی ئیستخبارات کە لەجیاتی موفەتیشی ئیداری ئەم نوقتەی تەرتیب فەرمووە بەندەی تەوکیل کردووە بەتەرجومەکراوی عەرزی حەزاری کەرامی بکەم.

ئەی حەزاری کەرام:

ڕۆژی ١٦ی کانونی ئەوەل لەتاریخی عیراقدا ڕۆژێك ئەبێت کە قەت لەبیر نەچێتەوە چونکە ئەوە ڕۆژێکە کەلەو ڕۆژەدا مەجلیسی ئەقوام قەراری‌دا کەئیدعای عیراق بۆ ویلایەتی موسڵ مەوافیقی عەدل‌و حەقانیەتە. ئێستا کە سێبەری تورکەکان ڕەفع بووە عیراق وەکوردستان ئەتوانن چاوەڕێی ئەیامی موسالمەت‌و سەعادەت بن، وەلازمە دەرخاتر بکرێ کە سەعادەت بەتەوحیدی مەساعی لەگەڵ ئەو دراوسیەکانا کە بەختوتی متواسیلەی برادەرانە پێکەوە بەستراون ئیستحسال ئەکرێ. لەهەموو خەیالاتی باتیلە ئیجتاب بفەرموون، وەقەتعەن گوێ مەدەنە موفسیدان وە قابیلیەتی مەلیەی خۆتان پشان بدەن.

زۆری پێ ناچێ عیراق مومەسیلەکانی خۆی لەناو مومەسیلاتی عالەمی مەدەنیەتدا لەسەر کورسی ئیحترام چاو پێ ئەکەوێ، ئیتر ئیستقبال بەدەست خۆتانە.

بەم موناسەبەتەوە منیش ئیشتراکی ئەم تەبریکاتە ئەکەم.

لەپاشا لەتەرەف جەنابی جەمال ئەلدین بەگ بابانەوە نوتقی ئاتی خوێندرایەوە:

من؛ زۆر تەشەکوری جهەتی ئیدارە ئەکەم، کە بەموناسەبەتی ئەم ڕۆژە مەسعودەوە بوو بەسەبەبی ئەم ئیجتماعەوە بە ئەم موناسەبەتەیشەوە ئیمکانی ئەوەبوو کە لەکوردستان لەحزوری ئومەراوە زابتانی موعەزەمەی بەریتانیاوە عیراق وەمنەوەران وە ئەشراف وەعولەماوە بۆ تجارانی کورددا دوو قسە بکەم:

وەکو ئەیزانن من خەتیب نیم وەکوردیش چاك نازانم لەگەڵ ئەمەیشدا نەمتوانی زەبتی حسیاتی خۆم بکەم وەلەپێش بڵاو بوونەوەی ئەم جەمعیەتە دوو قسە نەکەم.

واجەنابی موتەسەریف قەراری عوسبەتی ئەلئومەمی تەبیلغ کرد لام وایە ئەم قەرارە بەلا ئیستسنا موجیبی مەسرورەیەتە، شادمانن هەموو عیراقیەکە، وەبیلحامە مەنتیقەی کوردستان وەهەموو کوردێك بوو، چۆن موجیبی مەسروریەت نەبێ؟ کە وەزعیەتی کوردستان نسبەت بەعوسبەتی ئەلئومەم هەر لەمەعسومێکی بێ گوناهی ئەکرد کە موتەهەمی جنایەت وە لەسالۆنی مەحاکەمەدا مونتەزیری قەراری مەحکەمەیە بێ وەبێ‌شك ئەم قەرارە لەدووشت خاڵی نابێ، یا قەراری ئیعدام؛ یا قەراری تەبریە، ئێمەش بە ئەم دەرەجەیە، بەئەم دەهشەتە مونتەزیری ئەم قەرارە بووین، بەڵام شوکری خوا ئەکەین کە قەرارەکە عادیلانە. دەرچوو قەراری تەبریە، قەراری ژیانی کوردان بوو.

وەتاریخی ئەم قەرارە کە ١٦ی کانونی ئەوەلی ١٩٢٥-ە بوو بە فاتیحەی حەیاتی کوردوە لەم مەنتیقەیەدا بوو بەخاتیمەی حاکمیەتی تورك، زوڵمی تورك، ئامالی تورك، ئیستیبدادی تورك.

لەئەم قەرارەدا بۆ کوردەکان حەقێکی تر بەخشراوە ئەویش حەقێکی سیاسیە و عیبارەتە لەئەوەی کە لەمەو پاش مەنتیقەی کوردستان بە واستەی مەئمورینی کورد ئیدارە ئەکرێ وەزیانی کورد بەزەبانێکی رەسمی ئیعتبار ئەکرێ، وە لەم کاتەیشدا هەر بە ئەم زبانە تەحسیل ئەکرێ.

ئەم حەقە بۆ ئێمە لەتاریخدا سەحیفەیەکی تازەی گوشادەکردیە، رەشێتی وەیا سپێتی ئەم سەحیفەیە متەوەقیقی سەعی کوردانە.

ئیدامەوە موحافەزەی ئەم حەقە کە بۆ میللەتی کوردان بناغەیەکە هەر بەشتێك مومکین ئەبێت ئەویش معاریفە هەر بەسایەی معاریفە ئەمڕۆ بەشەر لەئاسماندا ئەفڕێ، وە لەژێر ئەرزدا وەلەژێر بەحردا سەیرو سەفەر ئەکاوە لەئەقسای عالەمەوە لەئانێکدا خەبەر وەرئەگرێ. موەجەد وە موئەسیسی ئەم ئیختراعاتە هەر وەکو ئێمە ئینسانە، وەلە خەڵقەت وە لە تەکامولی وجوددا لە ئێمە هیچ فەرقێکیان نییە. ئەگەر فەرقێکیش هەبووبێ ئەویش ئەوەتا کە ئەوان عالمن ئێمە جاهیلین، ئەوان ئەخوێنن ئێمە ناخوێنین ئەوان وەسائیتی تەحسیلیان زۆرە ئێمە نیمانە.

بینائەن عەلەیهی بۆ تەئمینی حەیاتمان وەئیدامەی مەوجودیەتمان لازمە هەموو بەیەکەوە جەهد بکەین وە ئەم ئەساسە بەلافاوی جەهل تێك نەدەین، وە بۆ تەعمیمی مەعاریف هەر مونتەزیری عاتیفەتی حکومەت نەبین، چونکە حکومەت لەبەینی ئەفرادی خۆیدا بەمساواتی مەعاریف تەوزیع ئەکا.

ئێمەش وەکو ئەیزانین زۆر پاش ماوین ئەو بەشەی کە حکومەت ئەماندانێ ئیحتیاجمان تەئمین ناکا، تێنوتیمان ناشکێنێ.

بینائەن عەلەیهی لازمە بۆ هەموو کوردێك کەخۆی بەکورد ئەزانێ موتەفیقەن بۆ تەسمیمی مەعاریف سەعی بکات، کەبتوانین لەگەڵ میلەتی نەجیبەی عەرەبدا وەکو دووبرا لەژێر عەلەمی عیراقدا بەمعاونەتی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا بژین، بژی کورد، بژی حکومەتی عیراق، بژی حکومەتی مەعەزەمەی بەریتانیا.

بەناو نیدای تەقریرو چەپڵەڕێزاندا جەنابی جەمال بەگ چووەجێی خۆیەوە لەعەقەلی مومائیلەیهی لەتەرەف محەمەد ئەفەندی تەڵەبەی مەکتەبەوە قەسیدەیەکی حەماسیە کە لەژێرەوە نووسراوە خوێندرایەوە:

چە خۆشە حوکمی عەدالەت؛ نەمانی مەحکومی
چە خۆشە رەفعی سەفالەت شیعاری مەزلومی
لەبەینی قەومو میللەدا چە خۆشە مەوجودی
چە ئافەتێکە حەقیقەتی بەڵایی مەعدومی
چە نەگبەتیەکە ئیلاهی، جەهالەتی میللەت
چە دەوڵەتێکە موئەیەد؟ ئەساسی مەعلومی
نەما لەسایەی عەدل ئیلەهی وەلوتفی خودا
لەسەر خراپەی ئەم کوردە سایەی بومی
لەفەیزی لوتفی خودارە ویلایەتی موسڵ
نەجاتی بوو بەتەواوی لەپەنجەی رۆمی
بل نەتیجەی زوڵمو جەفایە بۆ هەر کەس

بەرۆکی خۆی دەگەڕێ عاقیبەت بەمەشئومی
کەلامی فەخری هەموو کوردەکان گەیشتە فەلەك
کەتەرکی‌دا بەزەویدا خەیاڵی مەوهومی
کە عوسبەتی ئەلئومەم ئەم حوکمە عادیلانەیدا
حەیاتی‌دا بەعیراق وەنەماوە مەحرومی
بژین بەعەدلەوە عوسبەت لەگەڵ بەریتانی
چرای وڵاتە قەراریان بەلەفزوەمە فهومی

ئەنجا لەتەرەف جەنابی ئەحمەد حەمدی ئەفەندی کاتیبی داخیلیەوە نوتقی ئاتی خوێندرایەوە:

حەزەراتی کیرام:

ئەمڕۆ بەشەرەف و موبارەکی ئەم رۆژە مەسعودەوە کە لێرەدا ئیجتماعتان فەرمووە، ئەمەوێ منیش شتی خۆم چەند کەلیمەیەکتان عەرز بکەم کەقیمەتی ئەم رۆژە زیاتر تەزاهور بکات وە لەفکردا ئەبەدی نەقش ببەستێ.

هەمووما لەبیرماوە بەسائیقەی تەخەریباتی مەشئومەی حەربی عومومییەوە چەند حەیاتمان ئیمحا کرا، چەند خانەمان کوژایەوە، چەند منداڵ بێ باوك، چەند ژن بێوەژن مایەوە، ئەمەیش سەبەبی یەکانەی سەهوێکی تورکەکان بوو کە بەلا سەبەب وەتەئەمول ئیشتراکی حەربی عومومیان کرد وەهەر لەم رووەوە ئەنواعی فەلاکەتی تریش وەکو ریا وەگرانی وەسائیرە.. یەکتریان تەعقیب کرد ئێستاش ئەو خانوانەی کە لەبەربێ ساحیبی بوون بەکەلاوە هێشتا وەکو ئایدەی زوڵم ئیسپاتی و جودوە ئیعلانی خەوف وە دەهشەت ئەکات ئەو چاوانەی کە بۆ کوژراوانی ئەو رۆژە گریاون، هێشتا فرمێسکی چاویان نەنیشتۆتەوە، ئەو بریندارانەی کە ئەو رۆژە ناڵاندویانە ئێستایش فریادیان گوێی فەلەکی: کەڕکردووە، ئەو خوێنانەی کە لەبرینی ئەو رۆژە هاتووە هێشتا جەرەیان ئەکات، حاییلی ئەمە وەقایعی قرونی قەبلە ئەلتاریخیە نییە کەزیاتر ئیزاحی بکەم، ئەو بێ دەست وە بێ قوڵانەی ئەو رۆژە، ئێستاش لەناو بازاردا لەبەرچاومان ئەسوڕێنەوە وەسواڵمان لێ ئەکەن.

میلەتانی تریش فی ئەلواقیع لەئێمە کەمتریان بەسەردا نەهات بەڵام لەپاش خیتامی ئەم حەربە هەر چە بەقیقەی ئەلمسوقێکیان مابوو بەماڵ وە منداڵی خۆیان شادو شوکربوونەوە وەیەکتریان دەر ئاغوش کردو ئەشکی حەسرەتیان بەسەرشان و ملی یەکتریدا رشت، ئیتر کەوتنە شادمانی وەتەعقیبکردنی ئیستقبالێکی مەعلوم، چونکە نیهایەتی فەلاکەتیان هاتبوو، دەستیان بە (...) ئەو برینەوە تەشەبوسیان کرد بەتەلافی ئەو فەلاکەتە عەزیمە.

لاکین هەیهات ئێمەی بەدبەخت تازە ئەوەل فەلاکەتمان بوو، چونکە موقەدەراتی ئێمە هێشتا مەعلوم نەبووبوو، ئیستقبالی ئێمە وەکو شەوی دەیجور تاریك مابووەوە، بەعزێك لەبەر تەرەدود لەکاروکاسبی لە خەوو خۆراك مەحروم بووبوو، بەعزێکی تر هەر لەم خولیایەدا تەرکی حەیاتی کردوە بەنیهایەتی نەگەیشت.

تائەمڕۆ ئیحتمالی هەیە هەمووماں لەحاڵی سەفەر (...) چونکە بەرامبەر تەوقانێکی ئاگر راوەستابووین، چونکە لەبەرئەم ئەژدەهایەکی بێ ئەندازەدا عەرزی ئەندامماں ئەکرد، چونکە هەمووماں تێ گەیشتووین کە کوردە شیمالیەکانی براماں بەبێ سەبەبێکی مەعقول وە لەسەر ئیدعایەکی مەشروع وەداوای حقوقی خۆیاں قەسابخانەیەکیاں لێ دانان.

ئەنجا ئەمڕۆ کە بەواسیتەی تەساحوب وەئیلتفاتی بێ نیهایەی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا وەبیلخاسە بەسەبەبێ جوهدو ئیقداماتی فەخامەتی میستەر ئیمیری لەو تۆفانە عەزیمە، لەو بەڵا موبرەمە رزگاریماں بوو، ئەبێ هەموو فەردێکی عیراق وەهەموو میلەتی کورد ئەبەدەن مەدیونی شوکرانەو ئیلتفاتی حکومەتی فەخیمە بێ وەئەبەدەن ئەم تەشەکورانە فەرامۆش نەکات.

ئیتر بۆ ئێمە ئەمڕۆیە کەنیهایەتی فەلاکەتمان هاتبێ، ئیتر ئەمڕۆیە کەئێمە یەکتری دەرئاغوش بکەین ئیتر ئەمڕۆیە کە ئێمە تەلافی ئەو فەلاکەتەوە تەداوی ئەو برینە بکەین ئیتر لەسەر هەمووماں فەرزە کە ئەم رۆژە مەسعودە بەکین بەرەئسی تاریخ کە ئەبەدیەن فەرامۆشی نەکەین، ئیتر ئەمڕۆیە کە بووین بەساحێبی ئیستقبالێکی رووناک کەرێگای تەرەقی پێ بدۆزینەوە.

جەمعیەتی عوسبەتی ئەلئومەم کە لەحەل و فەسلی ئەم ویلایەتەدا حقوقی ئێمەی هێناوەتە پێش چاووە ئیستراحەتی ئێمەی دەرمیاں کردووە بژی عەدالەتی مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم، بژی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا، بژی میللەتی موتەحیدەی عیراق، بژی قەومی کورد.

لەدوای جەنابی ئەحمەد حەمدی ئەفەندی لەتەرەف تەڵەبەیەکی مەکبەتەوە ئەم چەند کەلیمەیە وترا:

ئەی خزم و کەسی موحتەرەم: ئەی بوزرگوارانی قەومی کورد، بەم هەموو مناڵیەمانەوە فەرق بەوە ئەکەین، کە ئیمڕۆ بۆ قەومی کورد رۆژێکی تاریخییە، ئایا زەریف حاڵی بووین وەتێ گەیشتووین، کە ئەقوامی عەزیمەی سەر ئەرز تەسدیق وەقبوڵیاں کرد کە لەمەو پاش (میلەتی کوردیش) مەوقعێکی ئیجتماعی وەسیاسی هەیە، وە لەرێزی قەوماں حقوقێکی رەسمیماں پێ بەخشراوە.

تا ئێستا گەلێ فرسەت لەدەست دراوە، حسن نیەتی حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیاماں بە نەشارەزایی تێك داوە، لازمە ئیتر بیر بکەینەوە، وە لەخەیاڵ دەرچین وەداخیلی کردەوە ببین، ئەی باوك و خزماں بۆ خاتری خوا، رق و خەیاڵ فرێ بدەین، داوای مومتەلەکات بکەین، خێر خواهی یەکتری دەبێتە سەبەبی نەجات وەرەفاهماں، ئێمە لەم سن و ساڵەدا وا لەناو بینایێکی مەکتەبا، تەمەناو ئینتزاری نەجاتی قەومی کورد ئەکەین، وەقیمەتی ئیتحاد تێگەیشتووین، ئاخۆ ئێوە کەدان و بەرگی ئێمە ئەدەن وە بە سایقەی موحبەتی عیلمەوە ئێمەتاں لەمەکتە باجەمع کردوەتەوە بۆ ئیستفادە لەنەتیجەی ئەم رۆژە گەورەیە، ئیتحادی ئەفکار حاسل ناکەن.

بۆ خاتری پێغەمبەر ئیتر رەحم بەمنداڵی ئێمە بکەن، با لەپاشئان ناوتاں بەخێر بێنن وە شیعاری قەومی کورد بەرزو بڵند بکەین وەبادیساں لە ئەسکەمیلەی حوریەت

دەرنەکرێینەوە بۆ سەفی زات.. (بژی) حقوق پەخشمان جەمعیەتی ئەقوام، (بژی) حامی حقوقمان حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا، بژی ئەقوامی موتەحیدەی عیراق.

ئەنجا بەم نوتقەی ژێرەوەی جەنابی رەمزی ئەفەندی وەبە نەشیدێکی وەتەنی لەتەرەفی تەڵەبەکانی مەکتەبەوە حەفلەکە نیهایەتی هات وەبەفەرح و شادییەوە بڵاوبوونەوە.

ئەی حەزەرات:

ئەم ئیجتماعەی ئەمرۆ قەومی کورد بە ئەبەدی ئەنووسێنێ بە بەریتانیای عوزەماوە وە بۆ ئیستقبالی تەبەشیر سەعادەتیان ئەکات.

ئەم رۆژە موبارەکە ئەبێ بکەین بەسەری تاریخمان وە لەم رۆژەدا ئەبێ رۆحانیەتی مێجەرسۆن، کە ئەم بناغەی موقەدەسەی ئیستقبالەی بۆ دامەزراندوین یاد وەتەجیل بکەین، بژی بەریتانیا، بژی عیراق، بژی کوردستان.

مێجەرسۆن موستەشرقێك بوو کە هەموو حەیاتی خۆی بۆ مەنافع وەسەعادەتی قەومی کورد حەزەرو فیداکردبوو، وە بەئەفعال و ئەقوالیی حەسەنەوە کتێب وە تەشەبسات وەغەزەتەی قەومی کوردی هێنایە ئەم مەوقعی بڵندی عیلم و ئیجتماعەوە.

هەموو وەختێك لەپێش فەتحی بابی تاریخی قەومی کوردا ئەبێ رۆحی ئەم موستەشریقە گەورەیە بهێنینە خاترمان، لەم سەعاتەدا ئەمین بن کە ئەو رۆحە لەسمت، لەرەئەسماندا پەرواز ئەکات دیسان بژی حکومەتی بەریتانیا وەحدەتی عیراقیە.

تەقریبەن مدەتی هەشتا ساڵە لەژێر ئیدارەی تورکاندا ناو و نیشانی تاریخی قەدیمی خۆمان کەم کردبوو. حەربی جیهان ئەم حەقە مەشروعەی پێ بەخشینەوە تەماشایەکی خەریتەی عالەم کەن لەبەحری فورسەوە بەخازەرستان وەبورستان و (...) سەنەندوج (سنە)وە ساوجبلاق وەجنوبی ئازەربایجانەوە بڕۆن بۆ بایەزدو کەناری بەحری رەش، وەدیسان لەبەحری فورسەوە بەکەناری راستی شەتی دیجلەوە بڕۆن بۆ دیاریبەکر وە لەدیاریبەکرەوە بۆ ئەسکەندەرونە، وەیاسەواحیلی بەحری سپی ئەم ئەرزە واسیعە لەناو ئەم دوو خەتەدا وەتەنی تاریخی عەزیزی قەومی کوردە، کە هەموو زەرەیەك خاکی نیشانەی خاکی کوردێکە.

حەقایق و نەتیجەی حەربی جیهان ئەهمیەتی عەزیمەی سیاسیدا بەم وەتەنەی ئێمە وەئێمەی خستە شەڕو شۆڕی حەیاتی سیاسیەوە وەحامیەکی گەورەی بۆ دۆزینەوە.

ئەم وەتەنەی ئێمە پەنجەرەیەکی قافقاسیایە، دەرگایەکی ئێرانە وەسەدەیەکی ئاهستینە بۆ ئیستیلای جنوبی تورك.

قەومی کورد لەم ئانەوە مالیکی ئیستقبالی خۆیانن، بژی کوردستان، ئەی کورد هیچ شوبهەتان نەبێ تورکەکان بۆ ئەخزی ئینتقامی ویلایەتی موسڵیان داوا ئەکردەوە کە ئەو مەزالیمە لەشیمالدا ئیجرایان کردبوو بەئێمەش تەتبیقی بکەن چونکە بەراحەتی کامیلە لەلایان مەعلومەوە کە قەومی کورد بۆ حقوقی حوریەتی خۆیان پارساڵ لەلای لیجنەی ئومەمیەلە فیداکاری و موتالەبە فاریخ نەبوون، لەم خسوسەوە ئەبەدی قەومی کورد مەدیونی شوکرانەی حکومەتی مەعەزەمەیەوە فیداکاری جەنابی مستەر ئیمیری تەقدیرو تەحسین کردووە بژی حکومەتی بەریتانیا بژی وەزیری موستەعمەرات مستەر ئیمیری.

ژیانەوە[٤٣]، ژ (٥٤) هەموو ژمارەکە تایبەتە بەو بڕیارە

## خەبراتی هەڵەبجە

"حەفلەیەکی تەبریکیە لە مژدەی قەراری عوسبەتی ئومەم لە خسوسی موحافەزە کردنی حدودی ویلایەتی موسڵ وە حقوقی کورد"

دوێنێ کە ۱۸-۲۱-۲۵ ڕۆژی جومعە بوو ناکاو لەئافاقی هەلەبجەدا غەلقەلەیەکی سرور هەڵسامژدەیەکی خۆشی نەباوە هەوای موعەتەری کوردستانا، بەواستەی تەلەگرافی بێ تەلەوە شرفورودی کرد، ئەم مژدەیە دەوایەم بوو کە حەیاتێکی تازەوە ئەبەدی بەخشی بەعمومی عیراق، بیلخاسە بەمیللەتی کورد. ئەم میللەتە مەزلومە کە هەتا ئێستا بەدەست زوڵمو تەغەلوبی تورکەکانەوە ئەی ناڵان. لەپرێکا خەبەرێکە واخۆش ئەسەری بووبێ وە ئەبەدی نەجات درابێ لەدەست تورک وەحقوقی موحافەزەکرابێ، وە لەو غائیلە عەزیمە کەسەبەبی فەوتاندنی مادی وە مەعنەوی میللەت بوو خەلاس بووبێ، عەجەبەن مژدە لەمە خۆشتر موبەشەرتر ئەبێت!

لەگەڵ ورودی مژدەکە بەواستەی حەمیەتەوە وەتەنپەروەری حەزرەتی قایمقامەوە دەست بەجێ لەدائیرەی حکومەتا ئەمر درا بەتەدارەك کردن بۆ حەفەلەیەکی تەبریکیە. لەخۆشیا لەتەرەف عمومی مەئموران وەئەهالیوە دەستکرا بەفەعالیەت. بەئانێك حەوشەی سەرا تەفریش کرا. جەنابی زابتی ئیرتبات (کاپتان مور) لەگەڵ متەباقی مەئموریني موحتەرەمەی حکومەتی فەخیمە وەقوماندانی، عەسکەری جەنابی جەمیل بەگ. لەگەڵ عمومی زابتانی (...) دەعوەت کران عمومی ئەشرافی مەملەکەت وەموتەباقی ئەهالی بەکەمالی سرور ئیشتراکیان کرد. لە دوای چاو قاوەخواردن وەئیکرامی فەوقە ئەلعادەی مەدعوەکان ئەو مژدەخۆشەی کەبەتەلەگراف لەتەرەفی حەزرەتی فەخم مەندوبی السامییەوە هاتبوو خوێنرایەوە. عمومی حازرین لەخۆشیا دەستیان کرد بەگریان لەدوایی لەتەرەف رەشید نەجیب ئەفەندییەوە ئیرتجالەن بەدەنگێکی بەرز نوتقێك خوێنرایەوە (...) عیبارەت بوو لەعەرزی تەشەکوراتی عمومی میلەتی کورد، بۆ حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا وەبیلخاسە بۆ زاتی سەباتکار (مستەر ئیمیری)وە بۆ جەمعیەتی موقەدەسەی حەقپەرست عوسبەتی ئەلئومەم، لەخیتامی قسەکانیا لەتەرەف حازرون وە بەچەپڵە لێدان وە بەدەنگی بەرز هەر بژی حکومەتی فەخیمە! مقابەلەکرا. وە دیسانەوە لەتەرەف شاگردێکی مەکتەبی هەڵەبجە جەمال ناوە وەنوتقێکی زۆر موئەسەر وەخۆش خوێنرایەوە وەعەینەن لەخوارەوە عەرزی ئینزاری قارئین کرا، دیسانەوە بەچەپڵەلێدان موقابەلەکرا. وە لە تەرەف شاگردانی مەکتەبەوە دەستکرا بەتەغەنی کردنی گۆرانی وەتەن، لەخۆشیا هەموو حازرون سروریان لەڕوو ئەتکا. وەگەورەو بچووك دەستیان کرد بەدەست گوشین وەتەبریکاتی یەکتری. حاسلی هەتا ئێستا موحیبەت تەسادوفی جەژنێکی واخۆشی نەکردووە وەئەم ڕۆژە لەتاریخی ئیجتماعی کوردا بە جەژنێکی میللیو موقەدەس ئەناسرێ هەر بژی حکومەتی فەخیمە! هەر بژی حکومەتی عیراق! هەر بژی میللەتی کورد! هەر بژی قایمقامی وەتەن پەروەری هەڵەبجە.

نوتقەکە کە لەتەڕەفی شاگردی مەکتەبی هەلەبجە جەمال ناوەوە خوێندراوەتەوە،
حەزاری کەرام:
مەعلومی هەموولایەکی ئەم میلەتە مەزلومەی ئێمەیە لەوساوە کە لەژێر دەست وەحیمایەی تورکە وەحشیەکانا بوو لەهەموو خسوسێکەوە لە تەرقیات وەتەعالی مەحرومیان کرد بووین. لەژێرپەردەی زوڵمو جەهالەتدا هێشتبوویانینەوە. ئەو زوڵمەی کەلەحەربی عمومیدا لەئێمەیان کرد تەبیعی لەفکر ناچێتەوە، بەواستەی سەعیو جوهدی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیاوە بەئیحتلالی عەسکەری ئێمەیان لەپەنجەی زوڵمیان نەجاتدا. حقوقیان پێ بەخشین بەم سەبەبەوە چاومان کرایەوە. تورکەکان چونکە ئیستفادەیەکی زۆریان لێ کردبووین هەر بەو تەماعەوە بەئەنواعی تەشەبسات بەناهەقی نەیان هێشت بەکەمالی ئەمنیەتەوە ئاسایش ئیدارە بکەین. ئەیان ویست دیسانەوە بمان خەنەوە ژێر ئیدارە موستەبیدەکەی خۆیان وە وەکو حەیوان ئیستخدامان بکەنەوە، دیسانەوە بەواستەی تەشەبسات وەهیمەتی فەوقەئەلعادەی حکومەتی فەخیمەی بەریتانیاوە عمومی حکومەتی موتەمەدینە تێگەیەنرا وە بۆیان مەعلوم بوو کە تورکەکان سەعی بۆ دەعوایەکی ناحەق ئەکەن. نەتیجە شوکر لەمەجلیسی عالی عوسبەتی ئەلئومەمدا قەرار درا کە حدودی حازرمان موحافەزە بکرێ.
حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا کە ئەم چاکە گەورەیەی لەگەڵ ئێمە کرد وە بەهەموو قوەتیەوە ئەم میللەتە مەزلومەی موحافەزەکرد وە نەجاتیدا ئومێد ئەکەین نابێ قەت لەفکرمان بچێتەوە وە هەموومان بەدڵ وەبەگیان بەسەمیمی تەشەکوری حکومەتی فەخیمە ئەکەین، هەر بژی حکومەتی فەخیمە، هەر بژی حکومەتی عیراق، هەر بژی میللەتی کورد.
ژیانەوە (٤٣)، ژ(٥٦)ل١

## پاشبەندی دەقەکان

لەکاتی نووسینەوەو گواستنەوەی دەقی نێو ڕۆژنامەکانی (ئومێدی ئیستیقلال) و (ژیانەوە)دا هەواڵو وتارو نووسینەکانی دوو توێی (ئومێدی ئیستقلال) هەرهەمووومان گواستۆتەوە، هی ڕۆژنامەی (ژیانەوە)ش ڕاستە زۆربەمان گواستۆتەوە، بەڵام چەند هەواڵو وتارو نووسینێکمان نەگواستۆتەوە چونکە هەستمان کرد ناوەڕۆکەکانیان لەناوەڕۆکی ئەوانە نزیکن کە گواستوماونەتەوە جا بۆ لێکۆڵەرو پسپۆڕان وا ناونیشیانەکانیان دەنووسینەوە تا بتوانن لەکاتی پێویستدا بگەڕێنەوە سەریان:

-یادداشت- وتار- ژیانەوە، ژ(٢٠)، ل١.

-سەر لەنوێ دەستکرایەوە بەمبارزەی سیاسیەی مەسئەلەی موسڵ- وتاری وەرگێردا،ژیانەوە، ژ(٢٧)، ل١.

-لەعوسبەتی ئەلئومەمدا، موسڵ، ڕاپۆرتە هەواڵ، ژیانەوە، ژ (٤٠)، ل٢.

-کوردو تورك، وتار، ژیانەوە، ژ(٤٢)، ل١.

-تورك وە مەسیحیەکانی مەنتیقەی گۆیان، هەواڵ، ژیانەوە، ژ (٤٢)، ل(٢).

-جەوابی تورك لەسەر شکاتی مەندوبی بەریتانیا لەبابەت مەسئەلەی مەسیحیەکانەوە، هەواڵ، ژیانەوە، ژ(٤٢)، ل٢.

-تەبلیغی ڕەسمی، ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەنووسی، ژیانەوە، ژ (٤٣)، ل٣.

-گەیشتنی هەیئەتی مەسئەلەی گۆیان بەموسڵوە تەسریحاتی جەنەراڵ لیدونێر برامبەر بە کوبارو ئەشراف، ژیانەوە، ژ(٤٨)، ل (٣).

-میستەر شەمبران لە ئیجتماعی مەجلیسی عوسبەتی ئەلئومەم، هەواڵ، ژیانەوە، ژ (٥٢)، ل(٢).

-تەلەغرافی هەیئەتی تەحقیقیەی گۆیان لەخسوسی وەقایمی سەرحدود، هەواڵ، ژیانەوە، ژ(٥٢)، ل (٣).

بەو شێوەیە دەتوانین بڵێین کە ئەم کتێبە تەواوی ئەو هەواڵو وتارو نووسینانەی لەخۆگرتووە کە ڕۆژنامەکانی (ئومێدی ئیستیقلال)و (ژیانەوە) بڵاویان کردۆتەوە.

## پەراوێزەکان

١. خسرۆ گۆران، كردستان عبر أزمنه التاريخ، الجزء الاول، سويد-١٩٩٢ ص١٥.
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤٩).
٣. د. عبدالفتاح علي بوتاني، موسڵ مدينه عرب والكرد، جغرافيا و تاريخيا، مجله (دهۆك) العدد (٢١) تشرين الاول- ٢٠٠٣- ص(٧٥).
٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٤).
٥. مەبەستم لەلایەنی جوگرافی و دەسەلاتدارێتییە.
٦. د.نوری تاڵەبانی، ئینگلیز ویلایەتی موسڵی لکاند بەدەوڵەتی عیراقەوە لەبەر بەرژەوەندی خۆی لەناوچەکەو لەبەر نەوتی کەرکوك، رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ژمارە (٣٢٣١) سلێمانی (٢٠٠٣/١١/٢٤) لاپەڕە (٧).
٧. زۆر خەڵك (سنجق) نەك (سنجاق) بەکاردەهێنێت.
٨. فاروق عەلی عومەر، رۆژنامەگەریی کوردی لەعیراقدا، وەرگێرانی تاریق کارێزی، هەولێر- ٢٠٠١ لاپەڕە (١٥) بۆ (بازیان) نووسراوە (بارزان) بەلام بازیان راستە.
٩. مام جەلال، دەربارەی کێشەی موسڵ، پێشەکی‌یەك بۆ کتێبی (د. فازڵ حسێن) کێشەی ویلایەتی موسڵ، وەرگێرانی محەمەد شاکەلی، سلێمانی ١٩٩٩، لاپەڕە ١.
١٠. یەزیدی وەك نەتەوە کوردن، بەلام ئاینیان جیاوازەو موسڵمان نین.
١١. د. فازڵ حسین، کێشەی ویلایەتی موسڵ، وەرگێرانی: محەمەد شاکەلی، سلێمانی ١٩٩٩، لاپەڕە (١٣٨).
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢).
١٣. سوود لە پەراوێزەکانی ژمارە (٦)و (١١) بینراوە.
١٤. د. فازڵ حسێن، کێشەی ویلایەتی موسڵ، لاپەڕە (٥٦).
١٥. هاوار، کێشە لەکوردستان لەسێ بەڵگەنامەی نهێنی ئینگلیزدا، گۆڤاری (پەیڤ) ژمارە (٤)ساڵی یەکەم، لەندەن ١٩٨٧، لاپەڕە (٦١٣).
١٦. رادوڤان پاڤیچ (پرۆفیسۆر) جولانەوەی رزگاریخوازانەی کورد لەخەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتی‌و سیاسی، وەرگێرانی: مەحمود مەلا عزەت، سوید- ١٩٨٥، لاپەڕە (١٧).
١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤١).
١٨. د. فازڵ حسێن، کێشەی ویلایەتی موسڵ، لاپەڕە (١٠٧).
١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٥).
٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٦).
٢١. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، دەربارەی هەڵوێستی نەتەوە پەرستانی عەرەب بەرامبەر بەمەسەلەی کورد، بەشی دووەم، رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ژمارە (٣٢٣٩) سلێمانی (٢٠٠٣/١٢/٨) لاپەڕە (٨).

٢٢. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، بەغدا ١٩٧٥، لاپەرە (١٥٧).
٢٣. د. عبدالفتاح علی بۆتانی، وثائق عن الحركه القوميه الكرديه التحررية، اربيل- ٢٠٠١- ص٤٢.
٢٤. ئەولیا چەلەبی، کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێرانی: سەعید ناکام، چاپی یەکەم، بەغدا- ١٩٧٩، لاپەڕە (٧٦).
٢٥. عەبدوڵڵا زەنگەنە، ژیانەوەو شوێنی لەرۆژنامەنووسیی کوردیدا، پێشەکی و پێداچوونەوەی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەولێر -٢٠٠٠، لاپەڕە (١٢).
٢٦. نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی رۆژنامەوانیی کوردی، بەرگی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٢، لاپەڕە (٣٧٦).
٢٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٨. فاروق عەلی عومەر، رۆژنامەگەریی کوردی لەعێراقدا، لاپەڕە (١٢٣).
٢٩. عەبدوڵڵا زەنگەنە، ژیانەوەو شوێنی لەرۆژنامەنوسیی کوردیدا، لاپەڕە (٧٧).
٣٠. د. أديب خضور، مدخل الى الصحافة نظرية وممارسة الطبيعة الثانية/ سوريه- ٢٠٠٠- ص٩٨.
٣١. ماڵکۆڵم ئێف. ماڵێتی، هاورێی رۆژنامەنووسان، سلێمانی- ٢٠٠٣، لاپەڕە (٤٩).
٣٢. لەهەر شوێنێ ئەم خاڵانەمان داناوە واتە دەقەکەمان پێ نەخوێندراوەتەوە.
٣٣. هەست دەکەم دەقەکان لەهەندێك شوێندا لەئەسڵی رۆژنامەکاندا هەڵەی چاپیان تێکەوتووە من بەبێ چاکردنەوەیان وەکو خۆیان تەنیا رێنووسەکانم گۆڕیون گواستومەتەوە.
٣٤. (مكدر) نووسراوە بەگوێرەی رستەکە (موکەدەر)ە، واتە (موقەدەر).
٣٥. (جنورە) یان (جەنوەرە).
٣٦. دیارە مەبەستی لەعەشیرەتی (گەردی)یە.
٣٧. لەوە دەچێت مەبەستی لەعەشیرەتی (گۆران) بێت.
٣٨. دیارە مەبەست لەعەشیرەتی (سوورچی)یە.
٣٩. ناوی ئەم عەشیرەتە بەهەڵە نووسراوە، بەڵام سەرچاوەی باوەڕپێکراوم سەبارەت بەرێنووسی راستی ناوی ئەم عەشیرەتە لەژێر دەستدانیە.
٤٠. دەبێ مەبەست لە (نیویۆرك)بێت.
٤١. ئەم دەقا لەکتێبی: (ژیانەوەو شوێنی لەرۆژنامەنووسیی کوردیدا، عەبدوڵڵا زەنگەنە) گوازراوەتە سەر رێنووسی ئەمڕۆی کوردستانی باشوور.
٤٢. هەموو دەقەکانی (ئومێدی ئیستیقلال) لەم سەرچاوەیە وەرگیراون و رێنووسەکانیان گۆڕدراون، رەفیق ساڵح، سێ رۆژنامەی رۆژگاری شێخی نەمر، سلێمانی- ٢٠٠١.
٤٣. هەموو دەقەکانی (ژیانەوە) لەم سەرچاوەیە وەرگیراون و رێنووسەکانیان گۆڕدراون عەبدوڵڵا زەنگەنە، ژیانەوەو شوێنی لەرۆژنامەنووسیی کوردیدا، هەولێر- ٢٠٠٠.

# سەرچاوەکان


## کتێب

١. ئەولیا چەڵەبی، کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا، و: سەعید ناکام، بەغدا- ١٩٧٩.
٢. ادیب خضور (دکتور)، مدخل الی الصحافة نظریة وممارسة، سوریه -٢٠٠٠.
٣. خسرو گۆران، کردستان عبر ازمنه التاریخ، الجزو الاول، سوید- ١٩٩٢.
٤. رادوڤان پاڤیچ، جوڵانەوەی رزگاریخوازانەی کورد لەخەباتیدا بۆ سەربەخۆیی نەتەوایەتیو سیاسی، و: مەحمود مەلا عززەت، سوید- ١٩٨٥.
٥. رەفیق سالح، سێ رۆژنامەی رۆژگاری شێخی نەمر، سلێمانی- ٢٠٠١.
٦. زەید سورچی، مسألة موصل، سلیمانیە- ١٩٩٨.
٧. عەبدوڵڵا زەنگەنە، ژیانەوەو شوێنی لەرۆژنامەنووسی کوردیدا، هەولێر- ٢٠٠٠.
٨. عبدالفتاح علی بۆتانی (دکتور)، وثائق عن الحرکة القومیة الکردیة التحرریة، اربیل- ٢٠٠١.
٩. فاروق عەلی عومەر، رۆژنامەگەریی کوردی لەعێراقدا، و: تاریق کارێزی، هەولێر- ٢٠٠١.
١٠. فازڵ حسین (دکتور)، کێشەی ویلایەتی موسڵ، و: محەمەد شاکەلی، سلێمانی- ١٩٩٩.
١١. کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتور)، کوردستان لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهامدا، بەغدا- ١٩٧٥.
١٢. ماڵکۆلم ئیف، مالیتی، هاوڕێی رۆژنامەنووسان، و: ئازاد حەسەن فەتاح، سلێمانی- ٢٠٠٣.
١٣. نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی رۆژنامەوانیی کوردی، بەرگی دووەم، سلێمانی- ٢٠٠٢.

## گۆڤار

١-دهۆك العدد (٢١) تشرین الاول، دهۆك- ٢٠٠٣.
٢-پەیڤ ژمارە (٤) ساڵی یەکەم، لەندەن ١٩٨٧.

## رۆژنامە

١-کوردستانی نوێ، ژمارە (٣٢٣١) سلێمانی (٢٠٠٣/١١/٢٤)، ژمارە (٣٢٣٩) رۆژی (٢٠٠٣/١٢/٨).

# ناوەڕۆك

# کتێبە چاپکراوەکانی شارەوانی سلێمانی

١-بیلۆگرافیای ڕۆژنامەنوسیی کوردی لە سلێمانی
٢-شەڕی بەردەکی سەرای سلێمانی
٣-سلێمانی و سەلاحوددینی موهتەدی
٤-ژیان، بەتەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی ١٩٢٦-١٩٣٨
٥-ئەمریکا و عێراق و ئەگەرەکان، کورد لە بەردەم چاوەڕوانییەکاندا
٦-یادی ٩ی حوزیرانی ١٩٦٣
٧-کارەساتی مەنعی تەجەولەکەی ١٩٨٥
٨-حکوومەتی کوردستان لە سلێمانی
٩-بەڵگەنامە - بەرگی یەکەم
١٠-تۆمارێکی شارەوانیی سلێمانی
١١-سلێمانی، زەمینەی پەرەسەندن و ململانێی تەسەوف
١٢-ئەلبومی مەکتەبی فەیسەڵییە
١٣-سەرچاوەکانی ئاو
١٤-فەرهەنگی ئینگلیزی - کوردی
١٥-ڕۆژنامەی ژیان
١٦-بەڵگەنامە - بەرگی دووەم
١٧-سەرۆك شارەوانییەکانی سلێمانی (١٨٩٠-٢٠٠٣)
١٨-یادی دووسەد ساڵەی شاری سلێمانی
١٩-لە دوو توێی یادداشتی شاردا
٢٠-شەکرە شارەکەم سولەیمانی
٢١-لە مەرگستانی حامیەوە بۆ سەیرانگەی پارکی ئازادی
٢٢-وەرزش و شاری سلێمانی
٢٣-توێژینەوەکانی شاری سلێمانی
٢٤-پرسیارەکانی هاتوچۆ بۆ شۆفێری ئوتومبیل
٢٥-گوڵ و گوڵلە و مارینز
A Summary about Sulaimani city-٢٦
٢٧-دەربارەی فیدراڵی یەکگرتن یەکێتی نیشتیمانی عیراقی
٢٨-گفتوگۆیەکی جیددی لەگەڵ صوبحی عەبدولحەمید و هاوڕێکانی
٢٩-نامەی چوارساڵەی کارو چالاکییەکان لە سلێمانی
٣٠-ترش و شیرینی
٣١-حقوق الشعب الكردي في ظل الدساتير و القوانين العراقية
٣٢-مۆدێلی ڕێزمانی کوردی
٣٣-فەرهەنگی زێوەری
٣٤-کێشەی ویلایەتی موسڵ لە دوو ڕۆژنامەی سلێمانیدا